


خاوەنی ئیمتیاز

دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم

سەرنووسەر هیوا قادر

گرافیک دیزاین ئارام عەلی

کاریکاتێر

شاهین حەسەن

1

ساڵی یەکەم

زستانی ٢٠١٣

# گۆڤاری ئەدەبی سەردەم بۆ؟



سەرنووسەر

لە کاتێکدا چەندان گۆڤار و دەیان ڕۆژنامە هەن، ئەبێت گۆڤارێکی نوێی ئەدەبی چی بکات کە گۆڤارەکانی تر ناتوانن بیکەن یان نایانەوێت بیکەن؟
هەندێك جار دۆزینەوەی وەڵامی هەندێك پرسیار قورستر و ئاڵۆزترە لە ساتی پێش دروستبوونی پرسیارەکە خۆی. بۆیە پێموایە کاتێك وەڵامی ئەم پرسیارە ئەدۆزیتەوە، لەهەمان کاتیشدا ئەتەوێت گۆڤارێکی ئەدەبی جیاواز دەربکەیت، نیشانەی ئەوەیە کارێکی قورست لە پێشە. بێگومان کاری ئەدەب چەند بەرهەمهێنی پرسیار و جوانی و خەیاڵە، هێندەش قورس و ئازاربەخشە. بەڵام لە کۆتایدا ئەوەی ئەمێنێتەوە جەوهەری ئەو جوانیەیە کە داهێنان پێشکەشمانی ئەکات.
ئەو هێڵە گشتییەی کە گۆڤاری ئەدەبی سەردەم ئەیەوێت کاری لەسەربکات، پێش هەرشت شکاندنی ئەو فۆرمە باوەیە کە دەستگیرە لەبەردەم پێدانی ئازادی ڕەها بە لایەنی هونەری، بەپێویستی ئەزانین چەندە گرنگی بە جدیەتی تێکست ئەدەین هێندەش گرنگی بە جدیەتی لایەنی هونەری گۆڤارەکە بدەین. لەگەڵ ئەمەدا هەوڵدان بۆ کۆکردنەوەی زۆرینەی دەنگە جدییەکانی ناو دنیای ئەدەبی کوردی؛ هەروەها گرنگیدان بە بڵاوکردنەوەی ئەو ڕەخنە و لیکۆڵینەوە و خوێندنەوانەی کە خاوەنی جۆرێك لە مەنهەجیەتن لە شێوازی نووسین و خستنەڕووی پرسیارەکانیاندا.
نامانەوێت هیچ بەرهەمێکی ئەدەبی جیهانی لە ڕێگەی وەرگێڕان لە زمانەکانی عەرەبی و فارسی و تورکیەوە بڵاوبکەینەوە، لە کاتێکدا ئەکریت وەرگێڕانی ئەو بەرهەمانە لە زمانە

ئەسڵییەکانەوە یاخود زمانێکی ئەوروپییەوە وەرگێڕێتە سەر زمانی کوردی، تەنها بەرهەمێك لەو سێ زمانەوە بڵاوئەکەینەوە کە دەقێك بێت بەو زمانانە خۆیان نووسرابێت.
هەوڵدان بۆ گرنگیدانێکی بەرچاو بە بەخشینی خەڵاتە ئەوروپییەکان بۆ ڕۆمان و ئەدەبی منداڵان لە جیهاندا، هەروەها ناساندنی کتێبە پڕفرۆشەکانی دنیا بە خوێنەرانی کورد، بەبێ گرنگی دان بەوەی کە هێشتا ئەو کتێبانە بە زمانی کوردی هەن یان نا. هەروەها لەسەرو هەموو ئەمانەشەوە گرنگیدان بەو کتێبە چاپکراوە کوردیانەی کە ئەکرێت کاریگەری گەورەیان هەبێت لە دنیای ئەدەبی کوردیدا، بەپێی توانا هەوڵئەدەین نەهێڵین وەك هەمیشە بە بێدەنگی ئەو کتێبانە بەناو دنیای کوردیدا تێبپەڕن، هەڵوێستەی جدی لەسەر ئەو کتێبانە ئەکەین و ڕانانیان لەسەر ئەنووسین.
ئاوڕدانەوەی ئەم گۆڤارە لە ئەدەبێکی جدی پڕ لە پرسیار، ئەشێت لەو ئەخلاقەوە سەرچاوەی گرتبێت کە ئەدەب ئەبێت ئینسانی تیادابێت، ئینسان بەو مانا فراوان و فرە ڕەهەندییەوە کە ئەکرێت ئەدەب هەمیشە و بێ بڕانەوە کاری تیادابکات، بەبێ پێدانی مژدەو پەیامێکی دەستەئەنقەستانە.
کایەی ئەدەب کایەیەکە لە جوانی و خولیا سەیروسەمەرەکانی ناو ئاڵۆزیی ئینسانەوە سەرچاوەی گرتووە، حورمەتگرتنی ئەدەبێکی جدی حورمەتگرتنی ئەو جیاوازیی و ئاڵۆزییانەی ئینسانە، ئەمانەوێت لەم پنتەوە ئاڕاستەی کارکردنی گۆڤاری ئەدەبی سەردەم بەرەوپێش بەرین.



ئەدەبی سەردەم

# بەیان سەلمان

بەیان سەلمان

ساڵی لەدایکبوون: ١٩٦١ کەرکوك

١٩٨٦/١٩٨١ کۆلێژی ئابوری و بازرگانی/ بەغداد

٢٠٠١/٢٠٠٠ دبلۆم لە ئەدەبی سەردەم/ زانکۆی پاریسی هەشت

٢٠٠١/٢٠٠٠ دبلۆمی لیسانس/ پاریس

٢٠٠٥/٢٠٠٤ ئەدەبی سەردەم و ئەدەبی فەرەنسی «تایبەتمەندی لە ئەدەبی خەیاڵدا»/ ماجستەر

کتێبی ‹‹نامۆیی سەر و هەرەسی دیمەنەکان›› / لێکۆڵینەوە بە زمانی عەرەبی

وەرگێرانی ڕۆمانی ‹ کهوف هایدراهوداهوس»ی سەلیم بەرەکات بۆ زمانی فەرەنسی

بوراق/ ڕۆمان بە زمانی عەرەبی

نەوەکانی مادایی/ ڕۆمان بە زمانی کوردی

بەسەرهاتەکانی خەزنە مەملوك/ ڕۆمان بە زمانی کوردی ٢٠١٢

سەرەتا سەبارەت بە ڕۆمانە تازەکەی
(بەسەرهاتەکانی خەزنە مەملوك)
قسەم لەگەڵدا کرد کە بۆ خۆم دوو
جارم خوێندووەتەوە و چێژیم لێبینیوە،
هەستمکرد لەو ڕۆمانەدا هێزێکی
گەورەی ئیستاتیکی و فەنتازی لە
شێوازی گێرانەوە و تەکنیك و زمان
و ڕووداوەکاندا هەیە، ئەمە لەکاتێکدا
بە پێچەوانەوە، نەمتوانی ڕۆمانی (
نەوەکانی مادایی) تەواو بکەم، ویستم
بزانم لەم بارەوە سەرنجی خۆی
چییە؟
بەیان لەم بارەوە پێیوابوو من تەواو
مافی خۆمە ڕۆمانێکم بەدڵ بێ و
یەکێکم بەدڵ نەبێ، پێشی وتم: بەڵام
دەبێ بزانی بۆ! چونکە کەسانێکی
زۆریش بێ ئەوەی بیان ناسم زۆریان
بەدڵ بووە. نەوەکانی مادایی بە
ستیلێکی زۆر نوێ نووسراوە، خوێنەری
کوردی ئاشنایی لەگەڵدا نییە، چەند
چەمکێکی نوێی لە خۆی گرتووە و تا
ڕادەیەك پڕ کۆدە، دەبێ خوێنەر زۆر
وریابێ لە خوێنەوەی ئەو جۆرە ڕۆمانە،
تاکو حوکمی پێشنەیی بەسەردا نەدا».
ئەم خانمە ڕۆماننوسە ئاماژەی
بەوەشدا کە ئێمەی کورد ڕۆمان
بە زمانی وەرگێڕاو لە ئینگلیزی و
عەرەبی و فارسیەوە دەخوێنینەوە،
لە ڕاستیدا ئەو ستیلە ئەسڵیە
نابینین کە ڕۆمانەکە پێی نووسراوە،
چونکە تەنها پێ لەسەر ناوەڕۆکەکەی دادەگرین،کە لەوانەیە لە
زمانی ئەسلیدا بە ستیلێك نووسرابێ خوێنەر چێژی لێ نەبینێ،
ئەوەشی ئاشکرا کرد کە ڕۆماننووس بەرهەمێك دادەهێنێ و
ئەمەش وەك هەر پرۆژەیەکی نوێ لە دونیادا یان دەبێتە شوێنی
پەسەندکردن یان جێی ڕەخنەیە، پرۆژەی نوێ هەمیشە جێی
ڕەخنەیە بەتایبەتی ئەگەر نووسەرەکەی ژن بێ و وتیشی»
جگە لەوەی ئەگەر نەڵێم تەعتیمکردن «بێدەنگی لێکردن» ئەوە
دەڵێم پارازیت هەیە سەبارەت بە نووسینی ژن و بە شێویەکی
زیرکانە ئیشی لەسەر دەکرێ، تاکو سەرکوت بکرێن و
نووسیەکانیان پەراوێز بخرێن، ئەمە فۆبیا نییە،
بەڵکو ڕاستییەکی تێبینیکراوە، جگە لەوەی من دوا
کەسم وەك نووسەرێك کە هەرگیز حەزم
بە خۆ نمایشکردن و خۆ دەرخستن نەبووە
لە میدیاکاندا، ئەگەرچی ئەمە مافێکی
نووسەرە کە بایی خۆی بایەخی پێ بدرێ تاکو
بەرهەمەکانی بە خوێنەر بناسرێن. ئەم پرۆژە نوێیانە
پێی دەڵێن لادان لە نۆرم کە کۆمەڵ ئاشانایی بە
نۆرمێك بوو پرۆژەی نوێ قبووڵ ناکات، تەنانەت بێ
ئەوەی کەسەکان خۆیان پێی بزانن ئەم بیرۆکەیە لەلایان
سەقامگیر دەبێ».
بە گوتەی بەیان نەوەکانی مادایی کە چوار ساڵ و نیو
بە نووسینەوەی خەریك بووە و دەیان جار جێی هێشتووە
و دواتر هاتۆتەوە سەری. هەروەها دەڵێت: دیارە من بۆ
هەموو ڕۆمانێکم و تەنانەتە شیعرەکانیشم هەمیشە پاش
تەواوبوونی دەقێکم مەودایەکی لێ وەرئەگرم و ئەوجا
دێمەوە سەری. لە ڕاستیشدا وەها تەماشای دەقێکم دەکەم
وەك منداڵێك کە تا پێ دەگرێ دەبێ هەمیشە ئاگاداری بی
و پەروەردەی بکەی. نووسەر تەنها خۆی لەگەڵ دەقەکەی
خۆی و کەسایەتیەکانی نێو دەقەکەی قسە دەکات و
ڕەدەکاریی ژیانی ڕۆژانەیان لەگەڵدا بەسەر دەبات، هەر بۆیە



لە کۆتایدا بەو شیوەیەش دەهێڵێ دەقەکە رووناکیی ببینێ کە خۆی بە باشیی زانیوە. بە بڕوای خۆشم نەوەکانی مادایی پرۆژەیەکی نوێیە و دەکرێ کەسانێك خێرا بچنە ناوی، کەسانێکی دی کاتیان پێویست بێ. هەر وەك تیوریناسەکانی ئەدەب دەڵێن: کە خوێنەر لەو شوێن و کاتەی دەقێکی تێدا خوێندۆتەوە، لەگەڵ چ کەس و کام گروپ و لە چ کۆنتێکستی دەروونی و کۆمەڵایەتی و سیاسی دەقەکەی خوێندۆتەوە هەموو کاریگەرییان بەسەر دید و بۆچوونی لەو خوێندەوەیەدا دەرئەکەوێ. لە هەموو حاڵێکدا نووسینی رۆمانێکی نوێ هەمیشە جێی بیروڕای جیاوازە. کێڵگەی ئەدەبی رۆمان نووسینیش ئێجگار بەرفراوانە و هەموو جۆرە ستیلێك و مۆدێلێك جێی تێدا دەبێتەوە ئەگەر خوێنەر ئاسۆی بیرکردنەوەی فراون بکات«.

لە راستیدا بەسەرهاتەکانی خەزنە مەملوك باس لە سەردەمێکی زۆر کۆن دەکات و نووسەر لێرەدا فەزایەکی مێژوویی خولقاندووە. ئەوەی بەلای منەوە لە کاتی خوێندنەوەدا سەرنج راکێش بوو، بەکارهێنانی زمانێکی سەردەمیانە بوو بۆ گوزارشتکردن لە رووداوێکی مێژووی،لەم بارەوە خوی بۆچونێکی تایبەتی هەبوو:

بۆ ئەوەی بچینەوە ناو ئەو سەردەمەوە، دەبوو رۆمانەکە بەو زمانە بنووسرێ. ئەوە من نیم کە قسە دەکەم، بەڵکوو خەزنە و کەسایەتیەکانی دیکەن. پاشان زمانەکە زۆر سادەیە، ئەگەر من ئەو رۆمانەم بە عەرەبی بنووسیبایە، دەبوو تەواو لە قاڵبی زمانی ‹‹فصحة››ی کۆنی عەرەبی بدەم، بەڵام ئەمە لە کوردیدا ناکرێ، زۆر ناشرین دەرئەچوو و دەقەکەی دەشێوان. زۆر گرنگە کە نووسەر ڕەچاوی ئەو جۆرە بەراوردانە بکات» ئەم نووسەرە کاتێ دەقێك دەنووسێ خۆێ لەخەڵك دائەبڕێ، بە تەواویی، تاکو لە کەسایەتیەکانی تێبگات، وەك خۆشی باسی کرد، رەنگە لە سەرەتادا بە زمانی کەسی سێهەم بنووسێ، وەك ئەمەی ‹‹بەسەرهاتەکانی خەزنە مەملووك›› دواجار بڕیاری دێتە سەر ئەوەی بە کەسی یەکەم بنووسێ، یان وەك ئەوەی لە رۆمانی ‹‹بوراق›› تێبینی دەکرێ کە بە زمانی کەسی دووهەم ‹‹انت›› نووسیویەتی، ئەمەش ستیلێکی قورسە بەڵام ئامانجێکی نووسەر دەپێکێ» بە پێی تیوری رۆمان، نووسەر رێکخەری جیهانی رۆمانە و ئەو دەیبینێ بە چ ستیلێك، بە چەند کەسایەتی و کامە شێوەیە قسە بکەن و لە چ کات و ڕووداوەکان لە کام شوینە بن«.

فێربوونی خوێندنەوە و نووسین کە تەوەرێکی بنەڕەتی ئەم رۆمانەی بەیان سەلمانە، لە لایەکەوە دەرگای خۆشبەختی دەکاتەوە بۆ خەزنە و لە لایەکیترەوە دەبێتە کێشەو بەڵا بۆی، من پرسیاری ئەوەم لێکرد کە ئایا ئەم حاڵەتە تاچەند لە ژیانی واقیعییەوە نزیکە و مەسەلەی خوێنەواری لە ژیانی واقیعدا تا چەند دەبێتە دەردی سەری و کێشە؟ ئەو بڕوای وابوو کەسایەتی سەرەکیی ‹‹خەزنە›› لە کۆنتێکستی زەمانێکدایە وا بووە، سەرەتا دەرگای ئازادیی و پلە و پایە و تا ڕادەیەك دەوڵمەندبوونیشی بۆ کردەوە، پاشان دەبێتە مایەی دەردەسەریی، چونکە خوێنەوار ئێجگار کەم بوونە لەو سەردەمە و سزادانی خەزنە ئەوەش دەسەلمێنێ کە لە



نەخشەی نووسین دەسڕدرێتەوە« ئەمە لە پێشاندا سزادانی خوێنەواری و نووسینە ئەوجا سزادانی کەسە، جگە لەوەی کۆیلەی بازرگانێکە کە نەك جەستەی هی ئەوە، بەڵکو دەیەوێ بە شێویەکی رەمزی مێشکی هەر بۆخۆی بێت. دیارە لەم سەردەمەی ئێستاشدا بە جۆرێکی دی سزای ئەو کەسانە دەدرێ کە زانستیان پێیە.
کە رۆمانێك دەنووسم بە راستی لەو کاتەدا بیر ناکەمەوە ئەمە لە ‹‹راستیدا›› چۆن وەردەگیرێ، چونکە من پلانی رۆمانێکم لەلا گەڵاڵە بووە و بەرە بەرە بەو شێوەیەیی خۆم مەبەستمە دەینووسمەوە، دواجار چی لە راستی نزیکی دەخاتەوە ئەمەش بۆ خۆی گرنگە. هەموو دەقەکانم لە مرۆڤ دەدوێن، لەو رۆمانەشدا مرۆڤێکی خوێنەواری کۆیلە هەیە، کە دەکرێ مرۆڤی ئەم سەردەمەش بێ ئیتر کورد بێت یان نا، شووناسی لەودا ببینێتەوە.
بەیان سەلمان بەهۆی شارەزابوونی لە زمان و تێکەڵاویی لەگەڵ کەشی ئەدەبی ئەوروپییەکاندا و هاوکات ماستەرەکانی، ئاگاییەکی باشی لە رۆمانی نوێی ئەوروپی هەیە و جگە لە ئاستە رۆشنبیریەکەی خۆی، هاوکات خوێنەرێکی جدیی رۆمانی نوێشە، لێرەدا دەمانەوێت بزانین تا چەند ئەو ئەزموونە جیهانییە کاریگەریی بەسەر ئەزموونی رۆماننوسی خۆیەوە دەبینێت،
ئەو پێی وایە کە کەسێك لە ستروکتوری زانستی ئەوروپی دەخوێنێ دەچێتە نێو ئەو جیهانە و خۆی لە هەموو جۆرە نووسینێکی نوێ دەدات.
ئەمڕۆ لە فەرەنسا بە تایبەتی کە مەڵبەندی نووسینی نوێیە، ئەو جۆرە نووسینانە زۆر گرنگن، چونکە سەردەمی ئەمڕۆ بە تایبەتی لە رۆژئاوا و ژاپۆن زۆر ئاڵۆزە نووسەر بە ویستی خۆی نییە کە رەچاوی دونیای سەردەم دەکات، ئەگەرچی دەقەکەشی باس لەسەردەمێکی دێرین بکات، دەنا لە داهاتوودا کەس دەقەکانیان ناخوێنێتەوە.
بەیان باسی لەوەکرد هەموو نووسەرێك رەنگدانەوەی ئەزموونی خۆی لە دەقەکانیدا هەیە« منیش مرۆڤم پێش ئەوەی نووسەر بم، شەڕ بە هەموو جۆرەکانی، دابران، مردنی کەسە هەر ئازیزەکانم، باوکم، دایکم، منداڵەکەم، براکەم، هاوڕێی زۆر نزیکم، برینداربوون لە ژیانمدا رۆڵێکی گەورەیان لە بیرو بۆچوونم هەیە و لە هەموو رۆمانەکانمدا رەنگ دەدەنەوە. مەرج نییە راستەوخۆ نووسەر دەریان ببڕێ، بەڵام ئەوانە دەبنەوە هەوێنی گرنگ و گەڵاڵە دەکەن و نووسینی قووڵ بەرهەم دەهێنن. هەموو ئەمانەش بەدەرنین لە بەدواچوونی نووسەر بە دوی زانستی و لە ئاشنابوونی بە هونەر و ئەدەب و نووسینی میللەتانی دی. لێرەوە ئەزموونی نووسەر و گەڵاڵە بوونی زانستی دەقێك بەرهەم دەهێنێ.
بەیان بڕوای وایە ئەمە بەو مانایە نایەت کە کاتێ دڵخۆش بین ناتوانین بنووسین، دەکرێ شاد بیت و خەریکی نووسین بیت، بەڵام ئەزموونی ئەو کەسە تەواو جیاوازە لەوەی پێشووتر کە دەقی ژیانی خۆی بەرهەمێکە و پڕ رووداوە.




بەیان ماوەیەکی زۆرە لە دەرەوەی وڵات دەژی و زۆربەی کاری نووسین و خوێندنەوەی بە زمانی عەرەبی

و ئینگیزییە، بەڵام ئەبێ چی بڵێت بەرامبەر بەو ئەزمونە جیاوازانەی ناو ڕۆمانی کوردی.
بەداخەوە ئێمە ناتوانین رۆمانی کوردی بەوانەی خۆشیەوە هەڵسەنگێنین، چونکە کاتێك ئەتوانرێت ئەوە بکرێت کە بۆ نموونە لە نێوان دووسەد سێسەد رۆماننووس کارەکانیان هەڵسەنگێنرێت» ئەوەی کە دەیبینین جارێ چەند رۆمان نووسێك هەن، ئەمەش بێ گومان بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە ئەزموونی کورد لە نووسینی رۆمان نوێیە،جگە لەوەی بواری چاپکردن بۆ هەموو کەس نەڕەخساوە، ئەگەر لە چاپکردنی کتێبێکیشدا بێت، ئەوە بە کولەمەرگی جێبەجێ دەکرێ. بەیان لێرەدا تا ئاستێك رەشبینانە تەماشای دۆخەکە دەکات و پێی وایە،هەمیشە دەبێ سەر بەلایەك بیت بۆ ئەوەی کارەکانت رووناکیی ببینن، ئەگەر نووسەرەکە ژن بێت ئەمە قورسترە. جگە لەوەی مەسەلەی باشیی دەقێك و خراپی بۆچوونێکی نسبیە، ئەوەی کە لەلای یەکێك باش بێت رەنگە لەلای کەسێکی دی وەهای نەبینێ. «دواجار هەمیشە باشە و جێی ڕێزە کە رۆمانووسمان زۆر بێ، چونکە هەر نووسینە کە وێنەی گەش و گەشەکردنی لایەنی رۆشنبیری میللەتێك دەرئەخات.

بەیان سەلمان ڕۆمانی «کهوف هایدراهوداهوس»ی سەلیم بەرەکاتی کردووە بە فەرەنسی، هەروەها شیعریش بە زمانی فەرەنسی ئەنووسێت، بەڵام نووسینی ڕۆمان بە زمانی فەرەنسی بەکارێکی ئەستەم ئەزانێت.

- نووسینی ڕۆمان زمانێکی زۆر تایبەتی دەوێ، دەبێ ئەو زمانە زمانی دایك بێ یاخود زمانێك بێ کە لە منداڵیەوە لەگەڵتدا بووبێ تاکو پێی بنووسی. هەروەها بەیان پێیوایە: دەربڕینی وشە و بەکارهێنانی زانستی کلتووری دەوێ، نموونەی «شێرکۆ فەتاح»ی هێنایەوە کە بە ئەڵمانی دەنووسێ یان ئەمین مەعلوف و کاتب یاسین بە فەرەنسی دەنووسن و سەلمان روشدی بە ئینگلیزی دەنووسێ، ئەم نووسەرانە جیاوازن چونکە ئەو زمانەی پێی دەنووسن زمانی یەکەم و دووهەمیانە.
- بەڵام بۆ شیعر ئاسانترە، ستروکتوری جیاوازترە، ئێستا لە ئامادەکردنی دیوانێکی شیعریم کە بە فەرەنسی نووسیومە و هێشتا هەر کاری تێدا ئەکەم. ئەگەر بە چاکیی زمانێك بزانی دەکرێ رۆمانێکی تایبەت بە کورد بە زمانێکی جیهانی بنووسی. زمان ئامرازێکی دەربڕینە کە دەسەڵاتت بەسەردا هەبێ دەکرێ بە زمانێکی هاوتەریبی زمانی دایك بنووسی ئەمەش بۆ نموونە لە رۆمانی یەکەمم ‹‹بوراق›› رەنگیداوەتەوە کە رووداوەکانی کوردین و بە زمانی عەرەبی نووسیومە.

# مێژووی شەیتانێك

گفتوگۆیەك
لەگەڵ
سەلمان
ڕوشدی
نووسەری
ئایەت
شەیتانی



**سازکردنی: کای شولێر**
**و. لە سویدییەوە: هیوا قادر**

**ئەوەندەم ڕۆژ لە ژیاندا نەماوە تیا بژیم. سەلمان ڕوشدی بەم شێوەیە بیری دەکردەوە، کاتێك لە یادی ڕۆژی دڵدا و لە ساڵی ١٩٨٩دا فەتوای کوشتنی خۆی پێگەیشت. ئێستا ئەو پیاوەی ئەو کاتانە پارێزگاری لە سەلمان ڕوشدی ئەکرد، باسی ئەو ڕۆژانە ئەکات کە ڕوشدی لەبەردەم هەڕەشەی بەردەوامی کوشتندا بوو. کای شولێر گفتوگۆیەکی چڕوپڕی لە لەندەن لەگەڵ ئەم نووسەرە دڵخۆشەدا سازکردووە.**

پۆلیسی ئاسایش ئەچن بۆ لای ڕوشدی و پێی ئەڵێن: تۆ پێویستت بە ناوێکی تازە هەیە. پێویستت بە شوناسێك و چەکێك و کارتێکی بانقی تازە هەیە. چیتر نابێت سەلمان ڕوشدی وەك ناوی خۆت بەکاربهێنیت. تەنانەت کاتێك ئێمەش لە ژوورێکدا لەگەڵتاین نابێت کەس ئەو

ناوە بەکاربهێنێت. ئەو ناوە نوێیەشی لەمەودوا ئەتبێت نابێت بە هیچ جۆرێك ناوێکی هیندی بێت.
سەلمان ڕوشدی خاوەن هەستێکی تایبەت و کەسایەتییەکی بەهێزە، کاردانەوەیەکی توندوتیژی بەرامبەر ئەم بڕیارە ئەبێت. لەکاتێکدا تەنها دە ڕۆژە فەتواکە دژ بە ژیانی دەرکراوە و هیچ دانیشتن و ڕێکەوتنێکیش سەبارەت بەم کێشەیە نەهاتۆتە ئاراوە.
ـ من هەمیشە ڕقم لەو ناوە بوو، بەڕاستی بەردەوام ڕقم لەو ناوە تازەیە بوو کە پۆلیس پێی بانگ ئەکردم. ناچاربووم واز لە کەسایەتی ناوەکەم بهێنم. لەپڕ ناوم بوو بە ڕیچارد یۆهانسۆن یاخود ناوێکی تری لەو جۆرە کە هەستێکی زۆر سەیری تیادا دروست ئەکردم، بۆیە هەمیشە ئەگەڕامەوە بۆ ناو دنیای ئەدەب بۆئەوەی بتوانم لەو ڕێگەیەوە شوناسی خۆم چنگ بکەوێتەوە.
لەو سەر وەختەوە بەشێوەیەکی سادە هەڵسوکەوت لەگەڵ ڕوشدیدا ئەکرا و خەڵکێکی زۆر خۆی لێ دوورە پەرێز دەگرت و هەندێکیش بەو حاڵە ترسناك و بەسەردا سەپێنراوەی کە ماوەی بیست ساڵی خایاند پێئەکەنین. بەڵام ئێستا خۆی بەرامبەر ئەو ڕۆژانە زەردە ئەیگرێت و ناهێڵێت جارێکی تر باروکەی لەسەر بکەن و چاکەتی گوللەبەنی لەبەرکەن، یاخود هەموو جارێك لەو ئوتومبیلەی کە ئەیگەیەنێت زوو دابەزێت و بەپەلە ڕابکاتە ناو ئەو ماڵە ئارامەوەی کە بۆی دەستنیشان کراوە.
ڕوشدی لە ژێرزەمینێکدا لە لەندەن پێشوازی لە ئەندریۆ ویلیسی پاسەوان کرد. ڕازیش نەدەبوو ئەوان بە هەر ناوێك هەیە بانگی بکەن. سەرەتا هەوڵیدا بەکۆمەڵێك ناوی پێکەوە گرێدراو ناو لە خۆی بنێت، بۆ نموونە وەك ڤلادیمێر خوسێ یان مارسیل بێکێت و لەم جۆرە ناوانە، لیستی ناوەکانی کە بۆ خۆی داینابوو بەم شێوە ئاسان و پێکەنین هێنەرە درێژی کردبووەوە، پێش ئەوەی خۆی ناوێکی پێکەوەگرێدراوی وەك کۆنراد و چیخەف دروستبکات: ناوی لێ نرا یوسف ئەنتۆن.
**ـ شتێك لە نێوان ناوەکانی کۆنراد و چیخەف دا هەبوو بۆ پیشاندانی ئەو حاڵەتەی من تیایدا ئەژیام. من ئەو کاتە پاسەوانەکە ڕستەیەکی پێووتم کە دواتر لەلام بوو بە جۆرێك لە بیرکردنەوە: «تۆ ئەبێت تا ئەو کاتەی خۆت ئەمریت بژیت». چیخەف گەورەترین چیرۆکنووسی دوورەپەرێزی و سڕینەوە و هەڵوێستە، منیش لە شوێنێك بووم هەستم ئەکرد لەو شوێنەدا بەجێهێڵراوم، بەعەزرەت گەڕانەوەی ژیانە ڕاستەقینەکەی خۆمەوە بووم.**





کاتێك ڕوشدی ناوە تازە و هەڵبژێردراوەکەی خۆی بە پۆلیس وتبوو، وتبووی ناوم بنێن یوسف ئەنتۆن، بەڵام توشی شۆك ببوو چونکە یەکێك لە پۆلیسەکان پێ وتبوو، باشە کەوایە لە مەودوا بە جۆی بانگت ئەکەین.
**ـ ناوەکەم بوو بە یوسف ئەنتۆن، تەمەنا ئەکەم خوێنەران لەوە تێبگەن دەستبەرداربوون لە ناو و ئەتنی و شوناسی خۆت چەندە قورسە. لەوەش تێبگەن ئەبێت من چەندە دڵخۆشبووبم کاتێك دواتر ناوە ڕاستەقینەکەی خۆمم پێ درایەوە.**
لە ١٤ی فەبروەری ساڵی ١٩٨٩ ـ ڕۆژی دڵەکان ـ ئایەتوڵڵا خومەینی فەتوایەکی فەرمی ڕاگەیاند:

«من بەفەرمی بۆ خەڵکی شانازی بەخۆوەکەری ئیسلامی ڕائەگەیەنم لە هەموو دنیادا کە نووسەری کتێبی «ئایەت شەیتانی»، هەروەها هەموو ئەو کەسانەی تریش کە بەشداربوون لە دەرکردنی کتێبەکە و ناوەڕۆکەکەیدا، ئەمانە هەموویان شەڕی دژ بە ئیسلام و پێغەمبەر و قورئان ئەکەن، بۆیە ئەبێت هەموویان سزای مەرگ بدرێن. من داوا لە هەموو موسڵمانان ئەکەم ئەو کەسانە لەهەرکوێیەکن بیانکوژن». سەلمان ڕوشدی ئەو ڕۆژە لە ماڵی خۆی بوو، ئەبوو دواتر لەو ڕۆژەدا لە ڕێوڕەسمی ناشتنی بروس چاتوینی هاوڕێیدا ئامادەبێت. زەنگی تەلەفوونەکە لێیدا و لە بی بی سییەوە ڕۆژنامەنووسێك بڕیاری کوشتنەکەی پێ ڕاگەیاند - ئەوە یەکەم جار بوو ڕوشدی گوێی لەو بڕیارەبێت. ڕۆژنامەنووسەکە لێی پرسیبوو هەست بە چی ئەکەیت؟ ئەویش وەڵامی دابووەوە و وتبووی: شتێکی باش نییە. لەویادا ڕوشدی بیری کردبوەوە و وتبووی کەواتە هەر لە ئێستاوە من پیاوێکی مردووم، ئەبێت چەند ڕۆژی ترم مابێت بژیم؟ بەم شێوەیە ڕووداوەکە درێژەی کێشا، پۆلیس هات بۆ ماڵەکەی و پێی ڕاگەیاند کە باشترە چەند ڕۆژێك خۆی ونبکات، تا دواتر دۆخەکە هێمن دەبێتەوە.

هەمووان پێیان وابوو چارەسەرێکی سیاسی بۆ ئەم کێشەیە ئەدۆزرێتەوە. بەڵام ئەو خۆشاردنەوەیە دوانزە ساڵی خایاند. ئەمڕۆ کە ساڵی ۲۰۱۲ یە ڕوشدی - بەڕێز سەلمان



کە بووە بە ناوی نووسین و بەم ناوەوە بانگ دەکرێت - هەرگیز نەیتوانی بگەڕێتەوە بۆ ماڵەکەی لە ئیسلینگتۆن. ڕۆمانی «ئایەت شەیتانی» لە بیرۆکەیەکەوە سەرچاوەی گرتووە کە ڕوشدی دەمێك بووە بیری لێکردۆتەوە - کتێبەکە لە پایزی ۱۹۸۸ دا دەرچووە و لەگەڵ دەرچوونیدا کێشەی ناوەتەوە. زۆر کەس سەرنجی خۆی لەسەر ئەم پیاوە وتووە بێ ئەوەی کتێبەکە بخوێننەوە، وەك کەسێکی تێکدەر و پەلاماردەرێکی قێزەون دژ بە موحەممەد پێغەمبەری ئیسلام لە قەڵەمدراوە. ناڕەزاییەکە سەرەتا لە وڵاتەکەی خۆیەوە هیندستان دەستی پێکرد. دوای ئەوە کتێبەکە لەوێ قەدەغەکرا بفرۆشرێت. موسڵمانانیش لەبەریتانیا بەرهەڵستی و تووڕەبوونی خۆیان دژ بە ڕۆمانەکە پیشاندا، بەتایبەتیش لە بێدفۆرد کە کتێبەکەیان بە لەتوپەتکراوەیی سوتاند.

سەرەتا ئەوەی پەلاماریدرا ڕۆمانەکە بوو. دواتر بەڕەسمی فەتوای کوشتنەکەی ڕاگەیەندرا، ئەمەش بووە هۆی ئەوەی وەرگێڕە یابانییەکەی ئەم ڕۆمانە بکوژرێت، هەروەها وەرگێڕە ئیتالیەکە بەچەقۆ لێیبدرێت و دواتر بژی و نەمرێت، خاوەن دەزگای بڵاوکردنەوە نەرویژییەکەش ویلییەم نیگار تەقەی لێبکرێت و برینداربێت.

لەپڕ کۆمەڵێك خەڵکی لە ناو وڵاتە ئیسلامییەکاندا دەستیانکرد بە جوینەوەی وشەی فەتوا. ئایا بەڕاستی ئەم وشەیە مانای چییە، ئایا بڕیاری کوشتنە، دەستورە، فەرمانێکی دینییە؟ تەنانەت ئەمە بۆ خودی ڕوشدیش مانایەکی سەیری هەبوو.

**- لە ڕووی ئیتمۆلۆگی وشەکەوە دەزانم مانای چییە، چونکە ڕەچەڵەکی ئەم وشەیە لە قسەکردنەوە هاتووە، پێچەوانەکەشی لە ئینگلیزیدا «فەرمان»ـە. بەڵام لە ئێستادا ئەم وشەیە مانای هەڕەشەی کوشتن ئەگەیەنێت.**

بەڵام تێگەیشتنی کتوپڕ و خێرا بۆ مانای فەتوا چییە؟

ـ بەڵێ، بەڵام کوشتن پەیوەندی بە «فەتوا» وەك وشەکەوە نییە بەڵکە پەیوەندی بە بڕیارەکەی خومەینییەوە هەیە. جیاوازی خومەینی لەگەڵ کەسە دینییەکانی تردا ئەوەیە کە ئەو خۆی گروپی ئامادە و تایبەت بە خۆی هەیە کە ئەتوانێ بیانێرێت بۆ هەر شوێنێکی دنیا و دەستبکەن بە کوشتن. ئەو پێشتر ئەمەی لەگەڵ ئۆپۆزسیۆندا کردووە. ئەمەش مانای وایە مەسەلەکە بۆ کەسێکی ٤١ ساڵی وەك ڕوشدی لەو پەڕی جدیەتدایە، بۆیە بیری کردۆتەوە و دواتر وتویەتی: کەوابێت من چەند ڕۆژێکی کەمم لە ژیاندا ماوە و ئەکوژرێم.
لە وتارێکدا، کە لەم ماوەیەی  رابردوودا لە ڕۆژنامەی تایمزدا بڵاوکرایەوە، یەکێك لە پاسەوانەکانی سەلمان ڕوشدی ئەگێڕێتەوە و ئەڵێت: هەرە هۆکاری ئەوەی کە تائێستا ڕوشدی لە ژیاندایە هۆی ئەو هەموو کۆنترۆڵکردنە باشەی ئاسایش بووە بەسەر جموجۆڵی دوژنمەوە. هەروەها دەڵێت هۆکاری دووهەمی مانەوەشی ئەوەیە کە ماوەی ئەو دوانزە ساڵە ئەو پاسەوانی لێ کردووە و زیاد لە جارێکیش دەمانچەی هەڵکێشاوە بۆ پارێزگاریکردن لێی.
**ـ من هیچ کاتێك تەنها نەبووم. لە هەستێکی زۆر سەیری تەنهایی و لە هەمانکاتیشدا لە هەستێکی تۆقێنەری بەردەوامدا ئەژیام. بۆ من زەحمەتبوو لە هەلومەرجێکی ئاوادا کوڕەکەم و خوشکەکانم و هاوڕێکانم ببینم. پۆلیس هەرگیز نەیان دەویست من لە لەندەن بژیم یان لەلەندەن بم، بەڵام من بەوانم وت: ناتوانن ڕێگریم لێبکەن لە بینینی کوڕەکەم و هاوڕێکانم.**



لەم دۆخە بەسەر سەپێنراوەدا یارمەتی تایبەتی ڕوشدی لەلایەن دۆست و هاوڕێ و خێزانەکەیەوە دراوە. دیارە لەلایەن هەموو کەسێکیشەوە نا بەڵکە تەنها لەلایەن ئەو هاوڕێیانەوەی کە خاوەن دەسەڵات بوون. بەتایبەتی سیاسەتمەدارەکانی لەندەن، هەروەها لەلایەن هاوڕێیەکی وەك هارۆڵ پنتەر و نووسەرانی وەك ئان ماکوان، مارتین ئامیس، ئیدوارد سەعید، بیل بوفۆرد، کریستۆفەر هیچنس، هەروەها وەك ئەندرۆ ویلی پاسەوان و دەزگای بڵاوکردنەوە و چاپەکانەوە. هەموو ئەو کەسانە هەوڵیانداوە باشترین هێز و پاڵپشتی ڕوشدی بن.
بەڵام ڕوشدی ناتوانێت تائەبەد ئاوا بژی، خەڵکەکان بەجۆری جیاواز بەرخوردی لەگەڵ ئەکەن، جێی سەرسوڕمانبوو کاتێك زۆر لە چەپەکانی ئەو سەروەختە لایەنگری ئەو بوون کەچی ئێستا پشتیان تێکردووە. بۆ نموونە نووسەرانی وەك جۆن بێرگەر و یوهان لی کار ڕەخنەی توندیان لە کتێبەکەی گرت، بەهەمان شێوە بەشێك لەو سیاسەتمەدارانەش کە سەر بە دنیای چەپن.
ـ من پێموایە تەنگەژەکان کارەکتەری ئینسانەکان ئەگۆڕن. ئەوانەی لە دەوروبەری منن کەسانی نازدارن، ئەوانی تریش عاجزم لێیان. هەروەها سەلمان ڕوشدی ئەڵێت؛ من لە کتێبەکەمدا نوسیوومە ترس وا لە ئینسانی باش ئەکات کاری خراپە بکات. لەهەمان کاتیشدا سەلمان ڕوشدی پێیوایە شتێکی باشە گەربێت و کتێبەکە وەك کتێبی گیرفان چاپبکرێتەوە. کتێبەکەش لەسەر مێزەکەی کەوتووە و کەس جورئەتی بڕیاردانی چاپکردنی ناکات بەو شێوەیەی ئەو بیری لێ ئەکاتەوە.

پرنسیپێك لەناو ئەم یاریەدا هەیە: كە ئەویش ئازادی ڕادەربڕینە، نووسەر بۆی هەیە خۆی بڕیار لەسەر بەرهەمەكەی خۆی بدات تا گفتوگۆ بخولقێنێت. دەرچوونی بڕیاری كوشتنەكەی ڕوشدی كەشوهەوایەكی سەیری خولقاند و ئەمەش ئینسانەكانی ترساند، بەتایبەتی سەلمان ڕوشدی خۆی. ڕۆمانی «ئایەت شەیتانی» لە زۆرینەی ئەو وڵاتانەدا بڵاوكرایەوە كە هەقی چاپكردنەكەیان كڕیبوو، بەڵام دەزگای چاپكردنەكە لە توركیا دوودڵ بوو لەبەردەم ئەم بڕیارەدا.

كاتێك ڕوشدی لەیەكەم ساڵی «خۆحەشاردانەكەیدا» كتێبی «هارون و دەریای چیرۆك»ی نووسی ئەم چیرۆكانە دیارییەك بوون بۆ زافەری كوڕی، سۆنیا مێزەی هاوڕێی لە ڕاندۆم هاوس نەیتوانی ئەم كتێبە چاپ بكات لەترسی ئەوەی نەبا هەراو زەنا و خوێنڕشتن لە هیندستان دروست بكات.

**ـ من توشی شۆك بووم كە بیستم وتویانە ئەم چیرۆكانە لە ڕۆمانی ئایەت شەیتانی خەتەرناك ترە. سۆنیا خۆی خەڵكی هیندستانە و ئەم قسەیەشی كاریگەری هەبوو لەسەر ئەوەی كە ڕەنگبێت دەزگای چاپەمەنییەكانی تر باوەڕ بە بۆچوونەكەی بكەن. كەس نەی ئەتوانی كتێبەكە چاپ بكات، ئەمەش نیشانی ئەوەبوو ئیتر من وەك نووسەر تەواو بووم. من و سۆنیا دواتر ئاشتبووینەوە، ئەوكاتیش دڵنیابووم دواتر پەشیمان ئەبێتەوە لەوەی دەرهەق بە من كردبووی.**

دواتر چیرۆكەكان لەلایەن هاوڕێیەكی تریەوە بیك بوفۆرد لە دەزگای گرانتا چاپكرا. هیچ ڕووینەدا و پێشوازییەكی باش لە كتێبەكە كرا. ئەبوو خەڵكە دیندار و فرە كلتوورییەكان سەبارەت بە كێشەی چاپكردنەوەی كتێبەكە لە دواڕۆژدا قسەیان بكردایە. ئاخر چۆن ئەكرێت لە بەرامبەر كێشەیەكی ئاوادا خۆت لابدەیت و قسە نەكەیت؟ سەلمان ڕوشدی، كەسێكی بێ دینە، بەڵام هەمیشەش مەیلێكی زۆری هەبووە بۆ دین و پرسیارەكانی. ئەو لە ماڵێكی موسڵمانی بێ لایەنەوە هاتووە و باوكی شەوقێكی زۆری بۆ دین وەك دەربڕینێكی كلتوری و پرسیارەكانی ژیان و مردن هەبووە.

**ـ لەو ڕووەوە باوكم كاریگەرییەكی گەورەی لەسەر من هەبووە. ئاخر ئەگەر تۆ چیرۆكێك لەسەر هیندستان و پاكستان بنووسیت ناتوانیت باس لە دین نەكەیت، خودی دین لە ناو پرسیارە دینییەكاندا غەرقبووە.**

ـ دین بەسەر ئەفسانەی خەلق و سیستەمی ئەخلاقیدا زاڵە. زۆرینەی جار ئەمانە جوانن، ئەگەرچی ئەمانە ڕاستیش نین. تۆ سەیری ئەو ئەفسانانە بكە كە شاعیریان دروستكردووە، بەڵام ئەمانە وەڵامی هیچ كام لەو پرسیارانەمان نادەنەوە. ئەمڕۆ زۆر شت سەبارەت بە دروستبوونی زەوی ئەزانین. تەنانەت ئەخلاقیش گۆڕانی بەسەردا هاتووە، ئەو سیستەمی ئەخلاقیەی كە لەگەڵ دینەكاندا هاتووە كۆنە. من پێویستم بە هیچ نەسیحەتێك نییە، بەڵام دین خاڵێكی دەستپێكی باشە تا لەوێوە بێیتە دەرەوە و گفتوگۆ لەسەر باشە و خراپە بكەیت.

ڕوشدی ئەڵێت: **ڕاستە زۆر لەو گفتوگۆیانە كە پەیوەندیان بە جۆرێك لە جۆرەكان بە «ئایەت شەیتانی» و هەڕەشەی كوشتنەكەوە هەبوو. ڕوشدی مەبەستی ئەوەیە كەبڵێت ئیسلامە ڕادیكالەكان**

**کەلەبچەیان خستۆتە دەستی ئیسلامەوە. ئەو پێیوایە کە هەرە کێشە سەرەکییەکانی ئەمڕۆ ئەوەیە کە دین گواستراوەتەوە بۆ ناو گۆڕەپانی سیاسی. ئەمەش تەنها پەیوەندی بە ئیسلامەوە نییە، بەڵکە بە هیندۆسی و مەسیحی و جولەکەشەوە هەیە ـ چونکە تاکو بێت پیاوانی دەمارگیری دینی ئەیانەوێت دەسەڵاتی سیاسی بگرنە دەست.**

**ـ من سەر بە وەچەی شەستەکانم و هەڵەی هەرە گەورەی ئێمەش ئەوەبوو نەمان ئەبینی چی بەڕێوەیە. ئێمە دینمان وەك شتێکی ڕۆژانە ئەبینی. خودا مردبوو. ئەمڕۆ دین ڕەنگە هەرە گەورەترین پرسیاری ئەم سەروەختە بێت.**

بنیایەم دەتوانێت بڵێت کە شتێك لە پێش و لە دوای فەتواکەی خومەینییەوە هەبووە؟

**ـ من پێموایە فەتواکە هێندەی ئەوەی یەکێکە لە نیشانەکانی گۆڕان هێندە خودی گۆڕانەکە نییە. بۆ من زۆر زەحمەت بوو لەو ساڵانەدا بڵێم ئەوەی کە ڕووئەدات بەشێکە لەو بەشە هەرە گەورەیەی تر. نووسەرانی موسڵمانی تر پەلاماردران و کوژران، بۆ نموونە لە تورکیا و وڵاتانی عەرەبی. بەهەمان هۆکار و تێڕوانینی سەدەکانی ناوەڕاست سەیرمان ئەکەن و بەهەمووومان ئەڵێن: کفرکەر، ناماقوڵیکەر، سوکایەتیکەر، بریندارکەر.**





**ـ بەڵام ئینسانەکان نایانەوێت گوێ لە من بگرن کاتێك بڵێم ئەمە پەیوەندی بە گۆڕانێکەوە هەیە لەناو ئیسلامدا. پێموایە فەتواکە دەستپێکێك بوو بۆ ڕووداوی زۆر گەورەی وەك پەلاماردانەکەی ١١ی سێپتەمبەر.**

بە درێژایی ئەمساڵ «نۆی ـ یانزە» کە کتێبێکی یاداشتنامەی شەست سەد لاپەڕەیی بوو هەمووی تەواو بوو. بەڵام سەلمان ڕوشدی هەرئێستا بەبێ هیچ خۆ سانسۆرکردنێك هەموو ئەو مێژووە ئەگێڕێتەوە. باسی سیاسی گەورە و نزیك لەژیانی تایبەتییەوە دەکات، ئەمەش هەم سەرنجڕاکێش و هەم نائومێدکەرانەیە، باسی بەگژداچوون و لێپرسینەوەی خۆی ئەکات. ئەو لەو ڕێگەیەوە کەم تا زۆر زانیویەتی کە ڕۆژێك دێت گەر بمێنێت باسی ئەم مێژووە دەکات.

**ـ من پیاوی یاداشتنامەنووس نیم. وەك سوسان سونتاگ کە یەك بەدوای یەك و بەجوانی یاداشتنامەکانی ڕیزکردووە و بەخەتێکی جوان لێی نووسیون، بێگومان بۆ ئەوەیەتی کە دواتر بڵاویان بکاتەوە. من تازە بەتازە بڕیارم داوە کە هەموو ئەو ڕۆژانە لە یاداشتنامەکەمدا بنووسمەوە. ئەمەش بۆ من زەختێك بوو شتەکانیش زۆر بەپەلە ڕوویان ئەدا، زەختێك سەرباری ئەوەی کە من خۆم یادەوەرییەکی باشم هەیە بەڵام هێشتا نەم ئەتوانی هەموو ئەو شتانەم بیربکەونەوە. یاداشتنامەیەکی پڕ لە وردەکاریم نووسی لەگەڵ باسکردنی ڕووداوەکان و قسەکردن لەسەریان.**

**ـ کاتێك هەموو ئەو شتانە تەواوبوون خەڵکانێك پێشنیاری ئەوەیان بۆ کردم لەسەر ڕووداوەکان بنووسم. بەڵام من تازە لەو تونێلە هاتبوومە دەرەوە، بۆچی ئەبوو لەبەرخاتری ئەوەی لەسەری بنووسم جارێکی تر بچمەوە ناوەوە. لەبەر ئەو هۆکارە هەستیارانە نەم دەویست ئەوەبکەم و وەك نووسەرێکیش**

**پێویستم بە مەودایەك هەبوو، بۆ ئەوەی بیری لێبکەمەوە، هەزمی بکەم و بتوانم سەرلەنوێ سەیری ڕووداوەکان بکەمەوە و کۆنترۆڵم بەسەریاندا بشکێت بۆ ئەوەی بتوانم دەستبکەم بە نووسین لە سەریان.**

هەروەها سەلمان ڕوشدی کەسێکی بەڵگە هەڵگر و بەدوواداچووی ورد نییە بۆ نامەکانی و ئەو یاداشتانەی کە بۆ زانکۆی ئیمۆری لە ئەتلەنتا نووسیویەتی. ئەوان بۆ ماوەی چوار ساڵ کاریان لەسەر ئەمە کرد بۆ ئەوەی دواتر ببێت بە بناغەیەك بۆ ئەو یاداشتنامە تازەیە. کاتێك ڕوشدی بینی کە ئەوان چییان کردووە غەریزەی خەبەری بوەوە، ئەو دەنگە بچکۆلەی ناو سەری کەوتە قسەکردن و وتی ئێستا کاتیەتی. لەگەڵ ئەوەشدا ئەمە کاتی خایاند تا لەوە حاڵی بوو کە ئەبێت چۆن کتێبەکە بنووسێت. واتێگەیشتبوو کە ئەبێت ئەم کتێبە وەك هەموو کتێبەکانی تری وەهابێت، نەك کتێبەکە تەنها وەك یاداشتنامەیەك بخرێتە ڕوو بەڵکە فۆرمیش بۆ خۆی گرنگ بوو. ئەبوو سەلمان ڕوشدی وەها بنووسێت وەك ئەوەی خوێنەرەکانی چاوەڕێی لێ ئەکەن بۆ نووسینی ڕۆمانێکی، واتا قوڵ و زۆر هەمەلایەن و گێڕانەوەی کەسەکان سەرنجڕاکێش بێت. بۆ ئەوەی ڕوشدیش بگات بەوە، داوای لێکرا کتێبەکە بە ڕاناوی تاکی کەسی سێهەمی نادیار بنووسێت، لێرەدا ڕوشدی توانی ئەو مەودایە وەربگرێت کە پێویستی پێیبوو لەگەڵ بابەتەکەدا. چونکە ئەمە تەنها ڕێگەچارەیەك بوو بۆ ڕوشدی کە وەك هەر کەسێکی تر بتوانێت ڕەفتار لەگەڵ خۆیدا بکات لەناو ئەو چیرۆکانەدا کە ژیانی ئەویان ئەگێڕایەوە.

هەندێك جار نووسینی ئەوە بۆ سەلمان قورس بوو بەتایبەت لەو لاپەڕانەدا کە پەیوەندییان بە عەشق و پارە و خیانەتەوە هەبوو. هەندێك جار بێ بەزەیی و هەندێك جاریش کەسێکی سەرڕاست بوو بەتایبەت بەرامبەر خۆی. هیچ کەسێك ناتوانێت تەنانەت دوژمنە حازربەدەستەکانیشی بڵێن ڕوشدی بۆیە ئەمانە باس ئەکات بۆ ئەوەی لەسەر حسابی ئەوانی تر خۆی بە کەسێکی جوان پیشان بدات.

**- خوێنەرەکان هەست بەوە دەکەن کە ئەم نووسەرە ئەزانێت خۆی کێیە، هەروەها هەموو شتێکیش لەسەر خۆی ئەزانێت و هیچ شتێکیش ناشارێتەوە. ناشکرێت ئەم کتێبە وابخوێنرێتەوە کە گەوایە من بۆیە نووسیوومە بۆ ئەوەی لەڕێیەوە داوای لێبوردنێکی زۆر بکەم.**

**- من پێموایە لە دیدی ئەدەبییەوە ژیانی شەخسی خۆم زۆر لەو بارودۆخە سەرنجڕاکێشترە. هەموو ئەو شتانەی لە دەوروبەری ئینسان ڕوودەدەن سەرنجڕاکێشن. بێگومان زۆرینەی نووسینەکە باس لە سیاسەت و ئەخلاق و دین و پرسیارەکانی ڕۆشنبیران ئەکات - بەڵام پێویستە هەموو ئەمانە لە ڕێگەی ئەزمونی ژیانەوە بگێڕدرێنەوە.**

کاتێك دەستت بەم نووسینە کرد هەستت بەهەمان ئەو ناڕەحەتیانە کردەوە کە لەو ماوەیە پیایدا تێپەڕیبوویت؟

- کەم تا زۆر بەڵێ. بەڵام ئەوەی باش بوو ماوەیەکی زۆری بەسەردا تێپەڕیبوو ئەو نووسینەش نەئەبووە هۆی ئەوەی هەستم بریندار بکات. بەڵێ ڕووی ئەدا هەندێك ڕۆژ لە کۆتاییدا مەزاجم تاریك ببێت، بەڵام نەك لەبەر ئەو شتانەی کە ڕوویاندابوو لە ژیانمدا



بەڵکە لەبەر ئەو باسانە بوو کە ئەو ڕۆژانە تیایاندا دەمنووسی.
نەخێر، سەرباری ئەوەی کتێبی یاداشتنامەکە باس لە ناکۆکی و هەڕەشەکردنێکی زۆری ئەو سەروەختەی ژیانی ڕوشدی ئەکات. بەڵام ئەو پێیوانییە ئەمە ئەبێتە هۆی نانەوەی ناکۆکی نوێ. ڕۆمانی «ئایەت شەیتانی» بە کفر تاوانبارکرا، بەڵام سەلمان ڕوشدی شتێکی تر ئەڵێت : «ئەمە تەنها چیرۆکێکە لەسەر ژیانی خۆم».
سەلمان ڕوشدی ئەمەیە و ئێستاش کەسێکی ئازادە، لە نیویۆرك دەژی و بەشێك لە خێزانەکەشی لە لەندەنن. بێ هیچ ڕێگرییەك سەفەر بۆ وڵاتەکەی خۆی هیندستان دەکات، ئەگەرچی ئەو خۆی کەسێکی گێل نییە بەڵام خۆی بەکەسێکی ئازاد ئەزانێت، وەك ئەو کەسەی پێش دەرچوونی فەتواکە ئەگەرچی تائێستاش فەتواکە بوونی هەیە، بەڵام بە فەرمی هەڵپەسێراوە.
سەلمان ڕوشدی بە قریقو قریقێکی خۆشەوە ئەڵێت: تارادەیەك بە ئاشکرا بۆ پشوو بردنە سەر ناتوانم بچم بۆ تاران.
بەشێك لەو نووسراوەی کە باس لە ژیانی سەلمان ڕوشدی ئەکات و بووەتە بەڵگەنامەیەك، ئەڵێت: سەلمان ڕوشدی ڕۆماننووس بەردەوام ئەتوانێت زۆر جوان بنووسێت، «وات لێ ئەکات بەسەر توێی ئاودا سەفەربکەیت و هەستبکەیت ئەوە ڕاستییە».






سەرچاوە: ڕۆژنامەی سڤێنسکا داگ بلادت، ڕۆژی ١٦ی سێپتەمبەری ٢٠١٢
SvB ١٢١٠١٦

**کۆشک**
**کایەی کتێب: ڕۆمان**
**نووسینی: فرانز کافکا**
**وەرگێڕانی: عەتا نەهایی**
**بڵاوکەرەوە: ناوەندی ڕۆشنبیری و هونەری ئەندێشە**




بەرهەمەکانی کافکا، بە تایبەت دوو ڕۆمانی بە ناوبانگی کۆشک و دادگایی، هەر چەندە بە بۆچوونی زۆر کەس هەوڵێکی داهێنەرانەی هونەری بۆ ڕەواندنەوەی تەم و مژ و ئاشکار کردنی راز و ڕەمز و نهێنییەکانی بوون و ژیانی مرۆڤن، بەڵام خۆشیان لە خەرمانەی تەم و مژدا دوو بەرهەمی پڕ لە ڕەمز و ڕاز و نهێنیین کە بە درێژایی دەیان ساڵە زهنی خەڵک و خوێنەران، بە تایبەت خوێنەری نوخبەی بیرمەندییان بە خۆیانەوە مەشغووڵ کردووە و دەیان و سەدان خوێندنەوە و لێکۆڵینەوە و تەفسیر و ڕاڤەیان لە سەر نووسراوە. هەر لە تەفسیر و ڕاڤەی ئایینیی و ئیلاهییاتییەوە بگرە تا تەفسیر و ڕاڤەی فەلسەفی و دەروون و ناسی و کۆمەڵناسی و... زۆربەی ئەم ڕاڤە جیاواز و تەنانەت دژوارانە لە خاڵێکدا یەک دەگرنەوە کە ئەویش بەتاڵ بوونی ئەم جیهانە داستانییانە لە هیوا و ئومێدە. ئایا ئەمە بەو مانایەیە کە کافکا وەک پێغەمبەری بێهیوایی ویستوویەتی بەم بەرهەمە داستانییە داهێنەرانەی نائومێدی پیرۆز بکات یان پیرۆزی بە نائومێدی ببەخشێت؟ ڕەنگە ئەمە لەو دەگمەن پرسیارانە بێت کە دەتوانین، تا ڕادەیەک بە دڵنیاییەوە وەڵامی «نا»ی پێ بدەینەوە. ناودارترین پاڵەوان و کەسایەتی داستانیی کافکا کە لەم دوو ڕۆمانەدا (دادگایی و کۆشک) بە یەک ناو (ک) دەردەکەوێت، هەموو شکۆ و شان و شەوکەتی مرۆیی خۆی، نەوەک لە نائومێدی، بەڵکوو لە خەباتی شێلگیرانەی لە پێناوی گرینگترین بەها و بایەخە مرۆییەکان وەردەگرێت.



# دێوانە ڕەوانبێژەکان

عەتا محەمەد

بێئاگا لەوەی تینا بەدزییەوە سەیرم دەکات، لەبەرخۆمەوە پێدەکەنیم. ئێوارەیەکی درەنگی کۆتایی پایز بوو، کزەی بایەکی دەهات و منیش لە حەوشە بەرانبەر بە خۆر ئاوابوون دانیشتبووم و خەریکی خویندنەوە بووم، کە لەناکاو دەستم لە خوێندنەوە هەڵگرت و دامە قاقای پێکەنین. دەشێت پێکەنین بە تەنیا، سامناکتر بێت لەوەی بەتەنیا بگریت.

لەناکاو تینا لێیپرسیم: دەزانیت هەمیشە حەزدەکەم لەکاتی پێکەنینەکانتدا، بێدەنگ لێتبڕوانم... نازانم بۆ؟ لەوانەیە لەوکاتەدا هەستبکەم کە زۆر بە خۆت دەکەیت، نەوەك کەسێکی تر. ئەگەرچی زۆر کەس لەوباوەڕەدان، مرۆڤ لەکاتی گریاندا زۆرتر خۆیەتی. بەڕاست بەچی وا پێدەکەنیت؟ من کە هێشتا پاشماوەی پێکەنینەکە لە سیمامدا مابوو، بەدەم بانگکردنەوە باوەشم بۆ کردەوە تا بێتە ژێر باڵم. پاشان پێموت: بەچیرۆکێکی سەیری بێرناردۆ ئاچاغای ئیسپانی ... یاخود راستتر بەحیکایەتێك کە لە رۆمانی (ئۆباباکواك)یدا هەیە. حیکایەتەکە بریتییە لە شێواندنێکی زۆر جوانی حیکایەتی (مردن و سلێمان پێغەمبەر). ئەو حیکایەتە، کە زۆر بەناوبانگە و لە زۆر سەرچاوەی کۆندا هاتووە، باس لەوە دەکات رۆژێك وەزیرێکی سلێمان پێغەمبەر لەبازاڕدا مردن دەبینێت. مردنیش بەچاو ئاماژەیەکی بۆ دەکات. ئیدی وەزیرەکە تێدەگات کە مردن بۆ ئەم هاتووە و زۆر دەترسێت. دەچێت بۆ لای سلێمان پێغەمبەر و رووداوەکەی

بۆ دەگێڕێتەوە و داوای لێدەکات (بەوپێیەی سلێمان پێغەمبەر توانا و دەسەڵاتی سەیری هەبووە) هەرچۆنێکە بیگەیەنێتە هندستان تا لە مردن خۆی بشارێتەوە. کاتێك سلێمان پێغەمبەر مردن دەبینێت، بەگللەییەوە پێیدەڵێت: بۆ بەچاو ئاماژەت بۆ وەزیرەکەم کردووەو ترساندووتە؟ مردنیش پێیدەڵێت: من وەزیرەکەم نەترساندووە، بەڵکو کە بینیم سەرسام بووم، چونکە دەبوو ئەمڕۆ لە هندستان ڕۆحم بکێشایە. بەڵام ئاچاغا زۆر جوان ئەو حیکایەتەی شێواندووە، بەوەی ڕۆژێك لە بەغدا کابرایەك لە بازاڕدا مردن دەبینێت و تێدەگات بۆ ئەم هاتووە و دەبێت پێش خۆرکەوتنی بەیانی، گیانی بکێشێت. ئەویش لەترساندا بەپەلە بەئەسپێك بەرەو ئەسفەهان هەڵدێت. مردنیش شوێنپێی هەڵدەگرێت و دوایدەکەوێت. لەئەسفەهان پیاوەکە خۆی دەکات بەدوکانێکی ئاوێنەفرۆشدا و لەوێدا خۆی دەشارێتەوە. درەنگانێکی شەو، کاتێك مردن شوێنەکەی دەدۆزێتەوە و دەچێتە ناو دوکانەکەوە، سەرسام دەبێت بەوەی کە کۆمەڵێك وێنەی زۆری کابراکە دەبینێت و ناتوانێت وێنە ڕاستەقینەکەی بدۆزێتەوە تا گیانی بکێشێت. ئیدی ماوەیەك بەسەرسامی لەوێنەکان دەڕوانێت و بەدوای وێنە ئەسڵییەکەدا دەگەڕێت، تا لەناکاو خۆرهەڵدێت و ناچار مردن ئەو شوێنە بەجێدەهێڵێت، چونکە وادەی مردنی پیاوەکە تێدەپەڕێت. جارێکیتر بزەیەکم بۆ تینا کرد و بەئاماژەی دەست کتێبەکەم نیشاندا، کە وێنەی مارمێلکەیەك لەبەرگەکەیدا بوو.

تینا بەهەمان سەرسامی پێشوویەوە پرسی:

- بەڵام تۆ بە کوێی ئەم چیرۆکە پێکەنیت؟

- ئەو بەشەی کە پیاوەکە دەتوانێت فێڵ لە مردن بکات و وێنە ئەسڵییەکەی خۆی لەناو وێنە ساختەکانی خۆیدا ون بکات، ئەویش بەهۆی ئاوێنەی ناو دوکانەکەوە. تۆ هەرگیز بیرت لەشتێکی وا کردۆتەوە؟ مەبەستم لەوە بوو بڵێم تۆ بیرت لەوە کردۆتەوە کە مرۆڤ هیچ نییە جگە لەو وێنانەی هەیەتی، یاخود بۆ خۆیی دروستدەکات؟

تینا وەك ئەوەی شتێکی بیربکەوێتەوە، قسەکەی پێبڕیم و وتی:

- دەزانیت ئێستا ئەو قسەیەتم بیرکەوتەوە، کە ماوەیەك لەمەوپێش، ئەوکاتەی نەخۆش بوویت، دەستتگرتم و بەبزەیەکەوە پێتووتم: نیگەران مەبە... لە هەموو بارێکدا مردنی من، مردنی وێنەیەکە و هیچی تر.

- بەڕاست ئەو قسەیەم پێوتیت؟ ئەوە نهێنییەکی خۆم بوو کە دەبوو نەمدرکاندایە لەلات. چونکە حەزمدەکرد ڕۆژێك چیرۆکێك لەبارەی شتێکی واوە بنووسم. بۆ نمونە لەبارەی کەسێکەوە کە وێنەی خۆی لێدەگۆڕێت و بەیانییەك کاتێك لەبەردەم ئاوێنەیەکدا دەوەستێت، هەستدەکات ئەوەی ئەم سەیری دەکات، کەس نییە جگە لە چێ گیڤارا. ئیدی بەشێوازی ئەو جل دەپۆشێت و سیگاری کوبایی دەکێشێت و بیرەوەرییەکانی خۆی لەبارەی شەڕی پارتیزانییەوە دەگێڕێتەوە. بەڵام ڕۆژێکیتر خۆی لەوێنەی ڕۆماننووسێکی ئیتالیدا دەبینێتەوە کە

ناوی تابۆکی یاخود شتێکی لەو بابەتەیە و بیر لە نووسینی رۆمانێکی گەورە دەکاتەوە لەبارەی بنەماڵەکەیەوە. ئیتر ئاوا بەو شێوەیە ئەو کەسە وێنەی زۆر کەسایەتی تر لەخۆیدا دەبینێت، لە ماسیگرەوە بۆ شەقاوە و وێنەکێش و زۆری تر. بەڵام ئەوە بزانە کە هەموو ئەو وێنانەی ئەو لەخۆیدا دەیبینێت، بەراستی بەشێکن لەخۆی. چونکە بیرت نەچێت ئێمە لە وێنەیەکی گەورە دەچین، کە لەزۆر وێنەی بچوکتر دروستکرابێت.

تینا بەجۆرێك لەبێزارییەوە وتی: دەزانم هەموو جارێك تۆ لە بابەتی وێنەدا توشی سەرەخولەم دەکەیت و لەناو زۆر دیمەنی سەیرو سەمەرەدا وێڵم دەکەیت. هەروەك ئەوەی ئێستا لەباسی ئەو کەسەدا توشی بووم، کە وێنەکەی دەگۆڕێت.

- دەزانی من دەمویست باسی ئەو وێنانەت بۆ بکەم کە وێنەیەکی جیاواز لەخۆیاندا نیشان دەدەن. تۆ دەتوانیت بەدرێژایی مێژوو وێنەی زۆر ئیماندار ببینیت، کە سەرئەنجام وەك بێباوەڕێك کوژراون، یاخود شۆڕشگێڕێك کە وەك خیانەتکارێك مردووە. خیانەتکارێك وێنەی شۆڕشگێڕێکی هەیە. ئەمەش دەمانخاتە بەردەم ئەو شەڕە بێئامانەی لەنێوان وێنەکاندا هەیە. بۆ نمونە وێنەیەك کە نایەوێت وێنەیەکیتر بێت، وێنەیەك دەیەوێت ببێتە وێنەیەکی تر، یاخود وێنەیەك دەیەوێت وێنەیەکی تر بکاتە هاوشێوەی خۆی.

دێتەوە یادت لەم رۆژانەدا سەیری ئەو گریانە بەکۆمەڵەی خەڵکی کۆریای باکورمان دەکرد، کە چۆن لە شەقام و گۆڕەپانەکاندا بە کۆمەڵ بۆ مردنی «کیم سۆنگ- ئیل»ی سەرۆکییان دەگریان؟ ئایا بەتەنها خۆشەویستیی راڤەی ئەو گریانە بەکۆمەڵەی کۆرییەکان دەکات، کە لەشەقامەکاندا خەڵکی شینو واوەیلا بکەن بۆ سەرۆکەکەیان، ئەو سەرۆکەی وڵاتەکەی کردبووە زیندانێکی گەورە و یەکێك لە هەژارترین وڵاتی دنیا؟ لەوانەیە تۆ بڵێیت دەشێت ترس توانای راڤەکردنی ئەوەی هەبێت و خەڵکی لە ترسی گرتن و سزا ئاوا بگرین. بەڵام ئازیزم ئەوە ئەو گرفتەیە کە دەمویست بۆت باسبکەم... گرفتی وێنەکانە. زۆرێك لەوانەی لە شەقامەکانی کۆریادا دەگریان و بەدەم قوڵپی گریانەوە بە مشت لەزەوییان دەدا، هیچ نەبوون جگە لەوێنەکانی کیم سۆنگ- ئیل خۆی، کە توانیبووی بەدرێژایی ساڵانی حوکمڕانی، بەشێکی زۆری وڵات بکات بە هاوشێوەی خۆی. یاخود لەوانەیە زۆرێك لەوانەی دەگریان، خۆیان لە وێنەیەکی کیم سۆنگ- ئیلدا بینیبێتەوە و بۆ خۆیان گریابن. لەیادەوەری تۆدا نییە، کە لە سەردەمی سەددام حوسەیندا دروشمێك هەبوو، لەسەر زۆر دیوار و شوێنی گشتی دەنووسرا و دەیوت: کە سەدام دەڵێت، ئەوا هەموو عێراق دەڵێت. سەددام حوسەین باوەڕی وابوو کە وڵاتێك بەخاك و خەڵك و پەلەوەر و ئاژەڵییەوە هاووێنەیەکی خۆیەتی. دەزانی خەڵکێکی زۆریش باوەڕیان وابوو، کە هاووێنەیەکی سەددامن. بەڵام لەوان ترسناکتر، ئەوانە بوون کە جیاواز و دژ بە وێنەکەی سەددام خۆیان نیشان دەدا، کەچی نەیاندەزانی لەراستیدا وێنەیەکی سەددامن. دەزانیت من نامەوێت باسی ئەوەت بۆ بکەم کە چۆن رژێمەکان وێنەی خۆیان دەسەپێنن بەسەر هەموو وێنەکانی تردا، یاخود وڵاتێك لەسەر وێنەی خۆیان کۆپی دەکەنەوە. هەرچۆن ناشمەوێت باسی ئەو هاووێنە بوونەت بۆ بکەم، کە ئێمە لە سەرسامیماندا بۆ کەسی وێناکراو



پێیهەڵدەستین، وەك چۆن خۆمان لێدەبێتە پاڵەوانی فیلمێك یاخود تۆ
بە منداڵی دەتویست ببیتە بووکەڵەکەت، کە ناوی باربی بوو.
ئەوکاتە دنیا کەمێك ساردببوو. تینا دەستی گرتم و بەرەو ژورەوە رۆشتین.
هێشتا نەگەشتبووینە ژووری میوان، لێیپرسیم: بابە تۆ خۆت رۆژێك هەستت
کردووە وێنەیەکی تر بیت؟
وەستام و بەبێدەنگییەکی پڕ لە سەرسامییەوە لە تینام ڕوانی، وەك ئەوەی پرسیارەکەی،
رووبەڕوی راستییەکی تاڵم بکاتەوە، وتم: دەزانی ئەوە وەهمێکی خۆشە ئەگەر پێمان وابێت
ئێمە بەدرێژایی تەمەنمان تەنها خاوەنی یەك وێنەین، یەك وێنە و بەس. بەڵام بەدرێژایی
ژیان هەوڵدەدەین تەنها یەك وێنەی خۆمان نیشان بدەین. وابزانم جارێك لە رۆمانێکی میلان
کۆندێراوە، چیرۆکی ئەو شاعیرە ناسکەم بۆ گێڕایەتەوە، کە چۆن لە پێناو بیروباوەڕیدا دەبێتە سیخوڕ بەسەر
خۆشەویستەکەیەوە و راپۆرتەکانی ئەم، کچە خۆشەویستەکەی دەگەیەنێتە سێدارە. با نمونەیەکی ترت
بۆ باسبکەم. کاتی خۆپیشاندانەکانی ١٧ شوباتت لەبیرە، کە چۆن چەکدارەکان بێڕەحمانە تەقەیان لە
خۆپیشاندەران دەکرد و لە خوێندا دەیانگەوزاندن؟ تۆ دەزانیت لەکاتی ئەو هاتوهاواراەدا هیچ چەکدارێك
نیشانەی لە کەسێکی دیاریکراو نەگرتۆتەوە، بەوەی دەیناسێت و رقی لێیەتی. بەڵکو ئەو تەقەی لە وێنەیەك
کردووە، وێنەیەك کە گرنگ نییە کێیە، بەڵکو گرنگ ئەوەیە کەسێکی نارازییە.
هەستمکرد بێزاری یاخود ماندوێتی لە سیمای تینادایە، هەربۆیە هەوڵمدا بابەتەکە بگۆڕم، بەوەی بە تینام
وت: ئەگەر بتوانێت دە وێنەم بۆ بهێنیت، ئەوا هەوڵدەدەم هەر ئێستا دە چیرۆکیان لەسەر بگێڕمەوە. دە
وێنە گرنگ نییە وێنەی چین. ئەویش پاش ماوەیەك گەڕایەوە و لەبەردەممدا دە وێنەی دانا، کە لە گۆڤارو
رۆژنامەوە بڕیبوونی. وێنەکانم لەیەکتر جیاکردەوە و بڵاومکردنەوە.
**یەکەم وێنە:** دیمەنی کۆمەڵێك شێتبوو، لە بازاڕێکی رۆژهەڵاتیدا بەجلوبەرگ و سیمای گاڵتەجاڕییانەوە.
**دووەم:** فەرهەنگێکی کراوەی گەورەبوو، زۆر گەورەتر لەو کەسەی خەریکی نووسین بوو تێیدا.
**سێیەم:** تەنها سفرێکی گەورەبوو.
**چوارەم:** وێنە بەناوبانگەکەی دۆنکیشۆتی لاواز بوو.
**پێنجەم:** وێنەیەکی گاڵتەئامێزی شەهرەزاد بوو بە جلوبەرگی راپەوە.
**شەشەم:** وێنەی میرێکی ورگنی سمێڵ زل بوو، لەکەنار دەریایەکدا پەنجەی بۆ دوور راکێشابوو.
**حەوتەم:** وێنەی جادوگەرێك بوو.
**هەشتەم:** وێنەیەکی نیوە سوتاوی شاری سلێمانی بوو.
**نۆیەم:** دیمەنی لەخاچدانی منداڵێکی ئیشکەربوو.
**دەیەم:** وێنەی کەسێك بوو، کە کتێبێك دەخوێنێتەوە، بەڵام پیتەکان لە لاپەڕەی کتێبەکەوە هەڵڕژاونەتە
خوارەوە.

ئیدی یەك یەك وێنەکانم هەڵدەگرت و پاش کەمێك سەیر کردن و وردبوونەوە لێیان، چیرۆکێکم لێیانەوە دەگێڕایەوە.
یەکەم وێنە، دیمەنی وەستانی کۆمەڵێك شێت بوو، لەناو بازاڕدا و من توانیم ئەم چیرۆکەی لێوە دروست بکەم. یاخود راستتر من لە سەیرکردنی وێنەکەدا، ئەم چیرۆکەم دەبینی:

## دێوانە رەوانبێژەکان

کاتێك توانیمان ئەندێشەی بازنەیەکی چوارگۆشەیی بکەین، وەك دێوانەکان دەیکەن، ئەوکاتە دەتوانین بەسەر بیری «کۆتاییبوون»دا زاڵبین، هەروەك ئەو دێوانانەی توانییان بەم کارە هەستن، کە ترسناکترین دەستەی باوەڕدارییان دروستکرد و دواتر هەموویان لەسەردەستی خەلیفەی عوسمانی «سوڵتان عەبدولحەمید»دا کوژران و جگە لە چەند نووسینێك، کەدواتر دەدۆزرێتەوە و ئەم چیرۆکە پشتی پێدەبەستێت، کەسیان دەربازی نابێت. هەرچەندە ئەو دێوانە ئیماندارانە، بیروباوەڕییان بەتەواوی لەناو نەچووەو جارجار لەشوێنە جیاجیاکانی جیهاندا بەدەردەکەون، ئەگەرچی هەندێکجار بەشێوازی زۆر جیاوازتر لەوەی پێشەنگەکانیان پێیهەستاون.
رێگای پێشەنگەکانیش، رێگایەکی سەیربوو لەخواپەرستیدا و پشتی بەدێوانەیی دەبەست تا لەخەیاڵەوە پەی بە مەجازی خودایی بەرن. وەك ئەوەی عەقڵ فریودەر بێت.
ئەم رێبازەش، لەلایەن ئیمانداراێکەوە دانراوە، دوای ئەوەی زانیارییەکی زۆر لەئایندا بەدەستدەهێنێت، دەگاتە ئەو باوەڕەی کە کورترین رێگا بۆ گەشتن بەخودا دێوانەییە، هەرچۆن موریدەکانیشی هەر دێوانەن و ناوی خۆشیان وندەکەن، چونکە هەریەکێکیان واتای هەموان دەدات.
بەسەرهاتی ئەم دێوانانە، حیکایەتێکی دیمۆکرێتسمان بەیاد دەهێنێتەوە، کە بۆرخیس لەو نووسینەیدا باسی دەکات، کە لەبارەی «نەمری»یەوەیە، ئەگەرچی باوەڕی تەواوی بەوە نییە، کە ئەم حیکایەتەی دیمۆکرێتس روویدابێت، بەڵام بەهەرحاڵ بەپێی گێڕانەوەکەی بۆرخیس، دیمۆکرێتس لەباخچەیەکدا، هەردوو چاوی خۆی دەردەهێنێت تا بتوانێت بیربکاتەوە و شتەکانی جیهانی دەرەوە سەرقاڵی نەکەن، کە دێوانە ئیماندارەکانیش وا دەکەن، بەوەی لەجیاتی چاویان، عەقڵ فەرامۆش دەکەن تا بگەنە ئەوپەڕی باوەڕ.
با ناوی ئەو ناوچەیە لەیادبکەین کە پەیڕەوانی ئەم مەزهەبە تیایدا دەژیان. هەرچۆن باسی قەتڵ و عام کردنەکەیان ناکەین، تا کەمێك لەخۆیان بدوێین. بەوپێیەی توانیبویان شتگەلێکی سەرسامکەر بخوڵقێنن، جیاواز لەوەی خەڵکی تر ئاشنان پێی و دەیزانن. بۆ نمونە ئەم دێوانانە توانیبویان ژورێکی سێگۆشە دروستبکەن کە هەر سێ گۆشەکەی پلە وەستاوبێت و نافوورەیان لەناو درەختگەلێك دروستکردبوو کە ئاو لەسەر لقەکانیانەوە دەپژاو وشەیەکیان بێکۆتا لێکدەدایەوە. تەنانەت بەسەر بیری مردندا زاڵدەبوون. ئەو کارە سەیرانەی لەتوانای ئەو دێوانە باوەڕدارانەدا بوو، کە رێگایەکی سەختی خواپەرستییان دۆزیبووەوە، دەگەڕایەوە بۆ ئەوە توانا سەیرەی لەرەوانبێژیدا هەیان بوو. کارە سەیرەکانیشیان بە وشە دەکرد



و هەوڵی بەرجەستەکردنیان دەدا. ئەمەش پێویستی بەمەشق و خۆڕاهێنانێکی سەخت هەبوو لە ڕاماندا، کە دەکرا «بۆ نمونە« تا ئەبەد لەدیمەنی گوڵێك رابمێنن کە لە زەینیاندایە و هەریەکە و بەجۆرێك وێنای بکات. بەختەوەر، دێوانە عاشقەکانیان بوون، کە دەیانتوانی بێکۆتا وێنای گوڵێك بکەن و سەرسامکەرانە وەسفی رەنگی شین بکەن، چونکە ئەوان وێنەی هیچ گوڵێك لەئەندێشەیاندا نەبووە، ئەوەندەی وێنەی گوڵێکی رەها لەئەندێشەیاندا بوو، کە هەموو گوڵەبینراوو نەبینراوەکانی لەخۆدەگرت. ئەم توانا سەیرەشیان بوو، وایدەکرد تەنها یەك دێڕ شیعریان هەبێت و بێکۆتا و بەدرێژایی رامانەکانیان، گۆڕانی تیادا بکەن و وێنەی لێوە دروستبکەن و راڤەی بکەن. هەر وشەیەك دەبووە سەرچاوە، هەروەك چۆن وێنە و رستەکانیش وابوون و دەچوونەوە سەر خوا. وەك ئەوەی هەر وشەیەك کورتکراوەی ئەوبێت و وێنەیەك، بنچینەی هەموو رستەکان بێت.

ئەو دێوانانە رێگای رەوانبێژییان دەگرتەبەر تا لەدەنگی تاقگەوە بگەنە جوانی رەها، کە ئەوپەڕی ئاسوودەیی دەگەیەنێت. ئەمەش هەندێك لەموریدانی دەستەکەی دەگەیاندە بیری خۆکوشتن. بەڵام راڤەکردنی ئەو توانا سەیرەی ئەو دێوانانە هەیانبوو لە عەشقدا، ئاستەمە. هەرچۆن هیچ لەبارەی گوزەرانی رۆژانەشیانەوە نازانرێت.

شەوێك کە ئەو دەستەیە لە دەوری ئاگرێکی بڵێسەدار دادەنیشن، ئاگرێك کە تەنها لە ئەندێشەیاندا لرفەی دێت، یەکێکیان دەڵێت: با ئەم شەو جیهان تا دوا سنوورەکانی مانا، لەدوو وشەدا کورت بکەینەوە. هەرخۆی پاش کەمێك بێدەنگی دەڵێت: درەوشاندنەوەیەکی خامۆش، یەکێکی تریان دەڵێت: دڵۆپێك لەتینوێتیدا. یەکێکی تریان: سنوورێك لەبێکۆتاییداو زۆر کورت کردنەوەی تر، کە نازانرێت دوایین کورتکردنەوە چییە پێیگەشتوون، بەوپێیەی ئەوان دەیانتوانی بێکۆتا وێنەی جیهان بکێشن.

دەبێت ئەو راستییە ئاشکرا بکەین، کە کاتێك دەڵێین «شەوێك کە ئەو دەستەیە لە دەوری ئاگرێکی بڵێسەدار دادەنیشن»، ئەوا مەبەست لەتەنها شەوێك نییە لە ژیانی ئەو دێوانانەدا، بەوپێیەی ئەوان بۆ خۆیان هیچ گرفتیان لەگەڵ زەمەندا نییە و دەتوانن شەوێك بێکۆتا درێژ بکەنەوە، وەك ئەوەی ئەوان لەخەیاڵێکی بێکۆتادابن. هەرچۆن وێناکردنی «دڵۆپێك لە بێکۆتاییدا» مانای یەك دڵۆپی نەدەگەیاند لەلایان، ئەوەندەی دڵۆپێکی بێکۆتا بوو.

بەڵام کۆتایی هاتنی ئەو دەستەیە، نەدەگەڕایەوە بۆ دژایەتی کردنی راستەوخۆیان بۆ سوڵتان و دەسەڵات، یاخود زۆربوونی ژمارەیان مەترسی دروستکردبێت. تەنانەت نەشدەگەڕایەوە بۆ ئەوەی کە ئەوان دەیانتوانی بێکۆتا وێنەی تر بۆ سوڵتان دروستبکەن. بەڵکو ئەوان لەیەکێك لەشەوە درێژەکانیاندا، رامان لە چەمکی ستەمکاری، دەیانگەیەنێتە ئەوەی لەشکرێك ئەسپسواری بەزەبر و زەنگ، لە رەوانبێژییانەوە بێنە دەرەوە و خوێنی یەك بەیەکی دێوانەکان بڕژێنێتە سەر زەوی. ئەو لەشکرەش زۆر بە سوارەکانی سوڵتان

عەبدولحەمید دەکەن.
لە گێڕانەوەی بەسەرهاتی دێوانە ڕەوانبێژەکاندا، هەرگیز ئاماژە بەشوێنی روداوەکە ناکرێت. هەرچۆن دەکرێت ئەو لەشکرەی لەخوازە و لێکچواندنەکانیانەوە دێنەدەرەوە، بەزۆر لەشکری تر بشوبهێنین. ئەمەش ئەو گومانەمان لا دروست دەکات، کە ئەو دێوانانە، لە سەردەمی سوڵتان عەبدولحەمیددا نەژیابن، بەڵکو لەهەموو ئێستایەکی تردا هەبن، کە ڕوویەکی تری بێکۆتاییە و ئەوان لەجەنگی ڕەوانبێژییدا کوژرابن.

*(تیناو چیرۆکە ئەندێشەکراوەکان) بریتییە لە سێینەیەک، ئەگەرچی دەمێکە نوسراونو ئامادەن بۆ چاپ، بەڵام تا ئێستا بەشی یەکەمی ئەو سێینەیە «وێنەو ئاوێنە« لە چاپخانەی ڕەنج ٢٠٠٧ بڵاوکراوەتەوە. ئەم نووسینە، بریتییە لە پێشەکی و چیرۆکێك، لە بەشی دووەمی ئەو سێینەیە بەناوی «وێنەو وێنە«، کە هیوادارم لەگەڵ بەشی سێیەم بەناوی «وێنەو دەمامك› لە ئایندەدا چاپییان بکەم.






**گفتوگۆیەك لەگەڵ ئەدۆنیسی باوكم**
**و. لە سویدییەوە: هیوا قادر**
**دیزاینی بەرگ : ئارام عەلی**
**لە چاپكراوەكانی دەزگای سەردەم**

خانمە هونەرمەند نینار ئیسبەر، کچی ئەدۆنیس، لەدایکبووی ١٩٧١، لە دە بەشی یەک لە دوای یەک و پێکەوە گرێدراودا، نزیکەی سەد پرسیار وەک باوک و شاعیر لە ئەدۆنیس ئەکات، پرسیارەکانی سەرەتا لەسەر دەستپێکردنی خوێندن و پەیوەندی ئەدۆنیس لەگەڵ ئیسلام، شیعر، سوریا وەک جێگای لە دایکبوونی و لوبنانیش وەک شوێنی نیشتەجێبوون، بەتایبەت لەو ساڵانەدا کە جەنگ هەموو شتێکی وێرانکردووە. دواتر پرسیارەکانی نینار لە ئەدۆنیس لەسەر ژن، لەچک، دینە تاکخواییەکان و تیرۆریزمە. ئەدۆنیسیش زۆر بە کراوەیی وەڵامی پرسیارەکانی ئەداتەوە و باس لە وەفا، هاوڕێیەتی، هەوەسبازی و لایەنی داهێنان ئەکات.
ئەم کتێبە یەکەم کتێبی نینار و ئەدۆنیسە پێکەوە، سەرەتا بە زمانی فەرەنسی بڵاوکراوەتەوە و دواتر وەرگێڕاوە بۆ چەندان زمانی تر، ئەم وەرگێڕانە کوردییە لە زمانی سویدییەوە کراوە و کتێبەکە لەلایەن دەزگای «ئەلهەمبەر» لەساڵی ٢٠٠٦دا لە سوید چاپکراوە.
گرنگی خوێندنەوەی ئەم کتێبە لەوەدایە ئەمانکات بە شاهیدی وانەیەکی دوو لایەنەی گرنگ لەسەر ئازادی. لەلایەن کچێکی هونەرمەندی ئازادی ناو دنیای ئەوروپا و شاعیر و ڕۆشنبیرێکی بە جورئەتی ناو دنیای عەرەبی. بێگومان زۆر لەو خوێندنەوانەی ناو ئەم پرسیار و وەڵامانەی ئەم کتێبە نزیکییەکی بەرچاوی لە بیرکردنەوە و کلتوری کوردیدا هەیە.

**دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم**



# گۆڕستانی ئاسەکان

**ڕەووف بێگەرد**

بێدەنگ بەرامبەر بە یەك دانیشتبوون، چاویان بە هەموو توانای ئەوەیان نەبوو بۆ چرکە ساتێکیش بیر و ڕوانینی و بیری لێبکەنەوە. درکی ئەو دەنگ و ژاوە ژاوەشیان نەدەکرد بەردەوامدا بوون. ئەوان لەناو دارستانێکی چڕ و زەوەندا بوون، لایەکدا دەگێڕا و ڕاگوزەر شتیان دەبینی، خۆیان لەسەر شتێکی دیاری کراو ڕابگرن کە لە دەوروبەریاندا لە بزاوتێکی کە زۆرکەم خاکەکەی بە دەرەوە بوو.

درەخت و دەوەنەکان بە شێوەیەك تێك چڕژابوون، تەنانەت ئاژەڵە گەورەکانیش نەیاندەتوانی بە ئاسانی هات و چۆی لە ناودا بکەن. جارێك لە گەرمەی خەیاڵ پەرتی و بیرکردنەوە ئاڵۆزەکاندا، تەنیا بۆ شکاندنی تەلیسمی بێدەنگیەکە دلێر بە سالاری وت: دەزانیت ورچی ناو ئەم بێشەڵانە بەناوبانگە، من لەبارەیانەوە چیرۆکی سەیرم بیستوە! دەبێت ئاگادار بین و لە دەرفەتێکدا بڕۆین.

سالار زۆر خەم ساردانە وتی: خوام دەکرد دەبوونە دڕندەترین گیانداری کێوی و پرزۆڵ پرزۆڵیان دەکردم. ئەگەر درەختەکانیش ببن بە ئەژدیها من ناتوانم ئێرە بەجێ بهێڵم. جەستەم وەك ئێسکەکانی شکابن ئازاریان پیا دەگەڕێت، من پێویستم بە حەسانەوەیە.

سالار بە درێژایی سێ شەو و ڕۆژی پێشوتر چاوی نەچووبووە خەو، ئەوەیش لەلایەك بێزار و لەلایەکی ترەوە زمانی ناوەوەی خێراتر خستبوە گەڕ. یەکەمجاری بوو بە درێژایی ئەو شەو و ڕۆژانە گەلێك پرسیار لە خۆی بکات کە پێشتر نەیکردبوون یان کەمتر بیری لێ کردبوونەوە. کەچی بۆ دواجار خۆی و پرسیارەکانی لە تونێلێکی بێ کۆتاییدا بینیەوە کە لەوە تاریکتر بوو هەنگاوێکی بێ ترس و گومانی تیا بنێت. لە ڕاستیا تونێلەکە فەزایەکی دەمامکدار بوو، ڕووە ڕاستەقینەکەی کاتێك ئاشکرا دەبوو کە تۆ لە خنکاندا بیت.

خەوی یەکەم شەوی ناو بێشەڵانەکەی سالار تێکەڵەیەکبوو لە دیمەنی سەیر و ناکۆك. لە بینینی جانەوەرێکی زەبەلاحەوە تا مێرووییەکی بچووکی مت بوو، کە لە ناکاوێکدا باڵ دەگرێت و گەورە دەبێت، دەبێتە باڵندەیەکی گۆشت خۆر و پەلاماری دەدات. یان دیمەنی دەیان ئەژدیهای شاخدار کە لە ئەشکەوتێکەوە بە فیشکەفیشك دێنە دەرێ و بۆ خۆراك دەزریکێنن، ئەوان بەرەولای ئەم ژەهری مەرگ دەڕێژن و ئەم بەدەم کەوتن و هەستانەوەوە ڕوو لە ڕەوەز و هەڵدێر هەڵدێت.

دیمەنەکان لە نێو پرخە و وڕێنەی سالاردا بە جۆرێك بەرجەستەبوون کە هەندێجار خۆیشی لە خەو ڕاست دەبوەوە، بێ ئەوەی ئاگای لە دەوروبەری بێت بۆ چرکەساتێك دادەنیشت و بێ ئاگایانە جارێکی دی سەری دەنایەوە. دلێر کە یەکەم شەوی بوو لەگەڵیا و وەك ئەو خەو کۆتی نەکردبوو، هەر فریای ئەوە دەکەوت لە کاتی وڕێنە و خڕ و پفەکەیدا، بە دەم وەنەوزی خۆیەوە هەڵی بسێنێت، هەڵساندنی باڵندەیەکی کڕکەوتووی سەر هێلکە و شێتێکی برسی لەسەر نان خواردن.

لە بەرەبەیاندا، کاتێك هێشتا درەختەکان لەو تاریکیەوە ئاڵابوون کە پاشماوەی فێنکی بەیانیەکی زووی مانگی ڕەزبەر دەیبەخشیەوە، دلێر بە زۆر سالاری هەڵساند و پێی وت:

- دەبێت بڕۆین و ئێرە بەجێ بهێڵین، مانەوەمان لەوە بێ ماناترە کە چەند و چوونی لەسەر بکەین.

سالار هەر بە چاوی خەواڵووەوە وتی:

- لای من نە ترس باوی ماوە نە کات، لەوەیش ماندووترم بتوانم بە ڕێگادا بڕۆم.

- خۆ تۆ ئەمشەو نەت هێشتوە منیش بنووم، پاسەوانی پرخەپرخی تۆ بووم.

- ڕاست دەکەیت، ئەمشەو سەدان خەونی ترسناکم دیوە، وا مەزانە ئاسوودە نووستبێتم.

- دەبێت وابێت، دەزانیت لەناو چ دۆزەخێکەوە هاتوویت! خەوی شەو بەچکەی ڕووداوەکانی ڕۆژە بە نامۆیی. بەڵام حەزدەکەم بزانم تۆ بەتەمای چیت؟ ئێرە شوێنی دڵنیایی نییە، خۆ هەروا لێرە دانانیشین جانەوەر بمانخوات یان لە برسانا بمرین!

- ئەمڕۆیش لێرە بەسەر دەبەین، تێر دەنووین و دەحەسێینەوە، دوایی قسەی لێ دەکەین، بە ڕاست ڕوو لە کوێ بکەین؟
- منیش نازانم، خۆمان دەدەینە دەست قەدەر و دەشێت جارێك ڕێکەوتێك بە دڵی تۆ بێت!
- ئەو ڕێکەوتەیش گرنگ نییە، بە ڕاستیی لەوە بێزارترم ژیان بە کۆڵمەوە بگرم و وەك منداڵی شیرەخۆرە بە هەرلایەکدا بیگێڕم، لە هەرجێگایەکدا توانام نەما دابنیشم و بۆی بگریم.
- منیش ماندووم، وەك تۆ نا، بەڵام تا ڕادەیەك بێزارم، بەو مانایەی تۆ نا کە دەستم لە ژیان شتبێت.
- تۆ ئازادیت. بەڵام ئەو خەونانەی ئەمشەو دیومن بەشێکن لەو ئاڵۆزی و ئاژاوە فراوانەی کە لای من بە خەستی سەری هەڵداوە.
سالار کەمێك وەستا، وەك بیر لە شتێك بکاتەوە وابوو پاشان وتی:
- بە تایبەتی دیمەنێك هەرگیز لە بیری ناکەم. پڕ لە ئازار و لە هەمان کاتدا چێژ بەخشیش.
- ئازار و چێژوەرگرتن؟ ڕەنگە خۆشەویستیت کردبێت!
- نا، لە شەوی وادا و لەدوای ئەو کارەساتەی بەسەرما هات خەوی وا ترسناکە، لەبەرئەوە نا کە ئاڵۆز یان شپرزە بێت، بەڵکوو لەبەرئەوەی ڕووداوەکان ئاسایین و دەشێت بێنەدی.
- مردبوویت و ئاگادار بوویت چۆن منداڵەکانت بەسەرتا دەگرین؟.
- دیمەنەکان زۆربوون. بەڵام ئەو دیمەنەی لە یادمە و چەند جارێك ناوکێشی خەونەکانی ترم بوون زۆر
ئاسایی بوو، وەلێ چۆن ئاساییەك!
- تێ دەگەم، وەك وتم ماندووبوونی لەو جۆرەی تۆ مەکۆی وڕێنە و خەونی سەیرن!
- سەیرە! لە گەرمەی هەرا و زەنایەکدا کە دەم بینی، لە جەرگەی ترس و لەرزێکی سەختا من ببوم بە شاعیر و حیکایەتخوان.
دلێر پێکەنی و وتی:
- شیعریی ئازاد یان ستوونی؟
- دیارە گاڵتەت پێ دێت! بەڵام من هەندێك لە کۆپلەی شیعرەکانم لەبەرە.
- لە خەودا شیعر لەبەردەکرێت؟
- دەڵێن گۆرانیبێژێکی خۆمان شەو بەدەم خەوەوە گۆرانیی وتووە، بۆ بەیانیی ئەوانەی لە نزیکیەوە بوون و گوێیان لێ بووە ئاوازەکەیان بۆ وتۆتەوە، ئەوییش وشەی بۆ داناوە و خۆشترین گۆرانیی لێ دەرچووە.
- بەهەرحاڵ دەبیت بە شاعیر یان نا کەیفی خۆتە، ئێستا وادەی تەگبیر و ڕای ڕۆیشتنە.
- تۆ زۆرت پەلەیە، لەوە دەچێت بەڵێنت بە مەرگ دابێت، من دەڵێم هەر لەبەری ئەم درەختانە بخۆین مانگێك زیاتر دەژین، تا دوو سێ ڕۆژی تر بەڵکوو ئاگرەکەیش ئەو تینەی نەمێنێت، پاشان شەوێك بۆی دەردەچین.
- وامەزانە ڕۆیشتنی شەویش ئاسان بێت، بست بە بستی ڕێگاکەمان چاو و گوێیە. ئەم ناوە بووەتە جەنگەی چالاکی و مەکۆی دوژمن، بێجگە لەوەی نازانین هاوڕێکانمان چییان بەسەرهاتووە و ئێستا لەکوێن!
- هەر دەبێت شەو بڕۆین و خۆمان تەریك بگرین، بەوەی باشە تاریکە شەوە، ئەگینا دەرچوونمان سەخت دەبوو.
- من لێرەیش دەترسم، با زۆر بێ باك نەبین، تۆ واز لە



جانەوەریش بێنە.
- بەهەرحاڵ بە ئاسانی چۆك لەبەردەم مەرگا دانادەین، کە هیچ پەنایەکیش نەما چی ڕوودەدات قیروسیا.
سالار بەرەو خۆرهەڵات سەیری لووتکەی چیاکانی کرد کە هەتاو زەردایییەکی ئاڵتوونی دابوونێ. کیسە خەوەکەی لە خۆی کردەوە و بە دلێری وت: خەونەکەمت بۆ بگێڕمەوە؟
لەو کاتەدا دەنگی پێیەك بەرەولایان دەهات، هەستیان ڕاگرت و گوێیان تیژ کرد. کە زانییان دەنگەکە نزیکتر دەبێتەوە دەستیان دایە چەکەکانیان و هەریەکەیان لە بن دارێکدا مەکۆی گرت. کە تارماییەکە دەرکەوت و وردەوردە لێیان نزیکتر بووەوە، دلێر تێی خوڕی. ئەو وەستا و زوو هاواری کرد، هاوارێك نیوەی گریان و نیوەکەی تری پاڕانەوە بوو. بە زمانەکەی خۆی کە ئەمان تێی دەگەیشتن وتی: (بۆ خوا مەمکوژن، من سەربازم و بە تەنیا پەرەوازە بووم، وا لە ترسا ڕام کردۆتە ناو ئەم دارستانەوە، ئەوەیش چەکەکەم بۆ ئێوە)
لەگەڵ دوا وشەیدا چەکەکەی بەرەولای ئەوان فڕێدا. سالار پێی وت: مەترسە، وەرە پێشەوە. دلێر وتی: ئاگاداربە، نەك پیلان بێت! سالار وتی: ئەوە دەنگێکی داماوانەی ڕووخاوە کە بۆ ژیان چ پەنایەکی بۆ نەماوەتەوە، دەتەوێت چی لێ بکەیت؟ بەڵام دلێر لە شوێنەکەی خۆی نەجوڵا.
خاوەن دەنگەکە سەربازێکی شل و شاوی ڕەنگ پەڕیو بوو، قەیتانی پۆستاڵەکانی کرابوونەوە و هەندێك جار ساتمەیان پێ دەدا، تەنانەت بێریەکەی هەڵەوگێڕاو لەسەرنابوو. پێش ئەوەی بگاتە لایان دلێر بانگی لێ کرد بوەستێت، بە سالاری وت: من دەچم دەیپشکنم و چەکەکەی دێنم، لەوانەیە نارنجۆکی پێ بێت! سالار وتی: دە وازی لێ بێنە برادەر، دیارە وەك خۆمان تەنیا کەوتو و داماوە، شەڕ کێ داماو ناکات! دلێر وتی: تۆ هەقت نەبێت، هەر لە جێگای خۆتدا بمێنەرەوە.
دلێر چەکەکەی چۆن هێنابوە سەرپێ هەروا هێشتیەوە و تەماشای دەوروبەری سەربازەکەی کرد. کە دڵنیا بوو بەڕێ کەوت. سەربازەکە و کۆڵە پشتەکەی بە وردیی پشکنی، کلاشینکۆفەکەی ئەوییشی لەگەڵ خۆیدا هێنا. کە سێ قۆڵی دانیشتن و سالار لە سەروچاوی سەربازەکەی ڕوانی دەستەسڕەکەی بەرباخەڵی دایە بۆ ئەوەی ئارەقەی دەم و چاوی بسڕێت، سەربازەکە لە کۆڵە پشتەکەی کۆمەڵێك خۆراکی دەرهێنا و زۆر زوویش چای لێنا. سالار بە دلێری وت:
- کێ لەم چۆڵەوانیەدا پسکیت و چای دەست دەکەوێت؟ هۆکاری سەرئێشەی چەند ڕۆژی من نەنووستن و چا نەخواردنەوەیە.
- سەرباز دەتوانێت لە سەنگەریشدا چا بۆ خۆی درووست بکات، گشت کەرەسەکانی پێیە.
- هەموو شتێکیان هەیە بێجگە لە بڕوا بوون! گەلێکیان هەر بەزۆر ڕادەکێشرێنە ناو ئەم دۆزەخەوە.
کە بێدەنگ بوون و لە سەربازەکەیان ڕوانی، ئیتر سەرمەد وا چیرۆکی خۆی بۆ گێڕانەوە:

( خەڵکیی شارێکی خوارووی وڵاتە، ساڵێك لەوەوبەر پەیمانگای هونەرە جوانەکانی بەشی مۆسیقای تەواو کردوە، تامەزرۆی بینینی چیا و ناو بەفر بووە، بەڵام لەو ڕۆژەوە کراوەتە سەرباز و بۆ ئێرەیان هێناوە چیای لەبەرچاو کەوتووە، چونکە بێجگە لە دەنگی تەقە و تۆپ و بۆردومانی فڕۆکە و هاوار و قیژەی دەوروبەری، گوێی لە هیچی تر نەبووە. تەنانەت شەوانە کە دنیا هێورتر بۆتەوە و ویستوویەتی گوێی لە دەنگی باڵدارێك، سیسرکێك، بۆقێك تەنانەت لوورەی گورگێك بێت، هیچی نەبیستوە. زۆر حەزی لە سینەما و شانۆ و مۆسیقایە، تاقانەیە و تەنیا سێ خوشکی هەیە کە هەموویان لە قوتابخانەن، باوکی مامۆستای قوتابخانەیە و دایکی کەیبانووی ماڵە، لەم ڕۆژانەی دواییدا کە شەڕ ناوچەکەی وێران کردووە، فەسیلەکەی ئەم پەرەوازە بوون، زۆریان لێ کوژراوە و تاك و تەرایان هەڵاتوون و نەیشیان زانیوە ڕوو لەکوێ دەکەن. ئەم بە ڕێکەوت ئەم دارستانەی دیوە و بۆ خۆشاردنەوە بە چاکترین جێگای زانیوە)

دلێر کە شتێکی لەبارەی سەربازییەوە دەزانی ناوی کەتیبە و لیوا و فەوج و فەرماندەکانی لێ پرسی. ئەو هەندێکی دەزانی، بەڵام لە ناوهێنانی فەرماندەکاندا هێند بێزار دەبوو حەزی بە ناوبردنیان نەدەکرد، یان هەر لە ڕاستیدا ناوی نەدەزانین.

سالار دوای تەواو بوونی قسەکانی سەرمەد هەر بە واق وڕماوی لێی دەڕوانی، لە نێوان خەون و ڕاستییەکدا دڵەڕاوکەی بوو. تا لەپڕێکدا هەستا و بەبێزارییەوە بە نێو درەختەکاندا کەوتە گەڕان. هێند دوورکەوتەوە لەوەدابوو لە چاو ون بێت. دلێر ویستی هاواری لێ بکات، کە بیری کەوتەوە بێدەنگبوو. تەماشای سەرمەدی کرد، کلاشینکۆفەکەی ئەویشی هەڵگرت و خێرا کەوتە دوای سالار، کە گەیشتە لای بەرەو دوای گەڕاندەوە. سەرمەد کە هیچ لە مەسەلەکە نەگەیشتبوو تووشی دوو دڵی هات، تۆبڵێی سالار لە قسەکانی تووڕە نەبووبێت یان ئەم هەر بە دوژمن بزانێت؟ ئەگەر وابێت چۆن دەستەسڕەکەی دایە و ئاواییش بێ باکانە پشت هەڵدەکات! تۆبڵێی سۆزی نەجووڵابێت؟ ئەی بۆ بە درێژایی دانیشتنەکە قسەیەکی نەکرد و زۆر بە مەبەستەوە گوێی لە چیرۆکەکەی گرتبوو! سەرمەد بەدەم ئەم لێکدانانەوە دەنکە هەنجیرێکی گەورە کە تیلماسکێکی زەردەی خۆری کەوتبوە سەر و دەستی ئەمی دەگەیشتێ بینی. بێ باکانە هەستا و هەنجیرەکەی لێ کردەوە، تا گەڕانەوەی ئەوان چەند هەنجیرێکی تری کردەوە و خواردی، گوێی لە دەنگی ئەو سەدان ڕیشۆڵە و قاژو و پەپو و کۆترانە گرت کە بە شەپۆل پێکدا دەهاتن، هەڵدەفڕین و دەنیشتنەوە. چاوی لەوانە بڕی کە یەکتریان ڕاودەنا و چلاوچڵیان دەکرد و لەپڕێکدا ون دەبوون. هەستی کرد ئەوە ئۆرکسترای بێ بەرنامەی سروشتە، لەناو ئەو دنیا زەبەندەدا هارمۆنیەك بە ئاوازە جیاوازەکان دەبەخشێت و مرۆڤ شەیدای خۆی دەکات. لە هەموو ئەمانەدا هەستی بە گەورەیی و جوانیەکی لە ڕادەبەدەری سروشت کرد، لە بەرامبەردا بیری لە کارە دزێوەکانی مرۆڤیش کردەوە، بە خۆی وت: خودا شتی جوانی دروست کردووە، تاقە شتێکی ناشیرین هەبێت مرۆڤە. ئەو لەوکاتەدا خۆزگەی بە بچووکترین و بێ دەسەڵاترین



باڵندە خواست کە توانای هەبوو بە ئازادی بفرێت و ئەو ناوە
بەجێ بهێڵێت. ئەو ئاگای لەخۆی بڕابوو. دوای کەمێك چەند دڵۆپێك
فرمێسك بەسەر ڕوومەتیا هاتنە خوارێ. هەر لە گەرمەی بیرکردنەوەکەیدا
هەناسەیەکی زۆر قووڵی هەڵکێشا کە لێوان لێوبوو لە بۆنی گەڵا و گوڵ و گیا
و هەوایەکی شەونماوی. بۆ چرکەساتێك گێژ بوو، ویستی چاو بنێتە سەر یەك و
وەنەوزێکی دوای ئەو ماندوبوونە سەختە بدات. بەڵام وژەوژی ئەو مێشولانەی بە سەروملیەوە
دەنیشتنەوە نەیان هێشت. لە ناوەوەی خۆیدا گوێ بیستی دەنگێك بوو کە بۆی جیا نەدەکرایەوە
ئایا دەنگی لق و پۆپ و گەڵای درەختە یان ئەو پەپوولانەی بێدەنگ بەلایدا تێ دەپەڕن! دەنگی
سروشتێکی پڕ لە ژاوەژاوە یان خودایەکی هێور و تەنیایە. کە زیاتر وردی کردەوە دەنگی نزا و
کڕوزانەوەی دایکێك بوو لە شوێنێکی دوور، زۆر دوورەوە دەناڵێ و دەپاڕێتەوە. کزەیەکی لێوەدێت لە سووتانی
پارچە گۆشتێك دەچێت بەسەر پشکۆیەکەوە. یان گریانی منداڵێك لە کاتی ون بوونیدا.
دلێر لە ڕێگا هیچی بە سالار نەوتبوو، کە دانیشتنەوە دوای کەمێك لێی پرسی: چیتە؟
- پێش ئەوەی ئەم سەربازە بێت بەتەمای گێڕانەوەی چیرۆکێك بووم، یان وەك پێم وتی خەونێکی شەوی
ڕابووردووم. وابوو؟ کەچی بە هاتنی ئەم برادەرە نیوەی خەونەکەم بوو بە ڕاست، لەوە دەترسم نیوەکەی
تریشی بێتە دی کە زۆر سامناکە!
- لە بیرمە، هاتنی ئەم کوڕە لێی تێکداین، ئەمیش هەر بۆخۆی چیرۆکێکە.
- چیرۆکێکی ڕاستەقینەی سەیر کە ڕێکەوت گونجاندوویەتی، ئەگینا ئەم بۆ ڕێی دەکەوێتە ئێرە؟ تا سێ
ڕۆژ لەمەوبەر یەکترمان لەسەر زەویەکی دوو سێ مەتری دەکوشت، ئێستا لەم وڵاتی تەیر و تواڵەدا، لەم
دووڕێیانی مەرگ و ژیانەدا بووینەتە برا!
- ئەو جێگایە ئەوەی دەویست و ئێرە شتێکی تر.
- بە زمانی کتێب هەلومەرجەکان جیاوازن، ئەمە ڕاستە، بەڵام نەدەبوو لە هەموو هەلومەرجێکدا
مرۆڤ هەر مرۆڤ بوایە! بەو مانایەی مرۆڤایەتی بوونەکەی لەسەرووی کاریگەریەکانی
دەوروبەریەوە بوایە؟
- ئەگەر وابوایە ڕاستیەکان لاسەنگ نەدەبوون. هەلومەرجە جیاوازەکان بیر و بۆچوونی جیایان لێ
دەکەوێتەوە. من و تۆیش هەروایـن.
- بە کورتی دنیا پڕە لە شەیتان!
- بەڵام ئێمە بە دوایدا دەگەڕێین نەك ئەو.
- لە تەنیاییدا هاوڕێیەتی شەیتانیش دەبێتە پێویست. مەبەستم لە تەنیاییەکی بەردەوام و ڕەهایە.
شەیتانیش قسە زۆر هەڵدەگرێت.
- وایە، بەڵام ئەوەی تۆ بیری لێ دەکەیتەوە دنیایەکی خەیاڵییە و هەرگیز نایەتەدی. ئەوە مێژووی

مرۆڤایەتی و کارەساتەکانی!
- منییش دەڵێم زەحمەتە، ئەمەیش جۆرێکە لە کۆیلایەتیەکی بێ مانا، کۆیلایەتی بۆ هەرشتێك. بە ڕاست بۆ ناتوانین پێکەوە بژین؟ تەواو وەك ئێستای من و تۆ و گوایە ئەم دوژمنە!
- ناتوانین. ئەگەر ئەم سەربازە پێش هەفتەیەك هەر بەم جل و بەرگانەوە بەرامبەرت دەربکەوتایە چیت لێ دەکرد؟ بێگومان دەتکوشت، ئەویش هەروا.
- من دەڵێم ئەگەر مرۆڤایەتیی ڕەگاژووی ناو ڕۆحی مرۆڤەکان بێت بە هەموو جیاوازیەکانیانەوە کات و شوێنەکان کاریگەریان نامێنێت.
- برادەر تۆ باس لە پرسیارێك دەکەیت هەزاران ساڵە دەکرێت و تا ئێستا بێ وەڵامە، بە ڕاستی هەزارانیشی شێت کردوە. ئەو دنیایەی تۆ خەیاڵی لێ دەکەیتەوە نەك هەر نایەتە دی بەڵکو تابێت مەحاڵتر دەبێت.
- کەسێك، فریادڕەسێك، ئومێدێك؟!
- هیچ.. هیچ، ئەوەی لەوبارەیەوە دەوترێت یان وتراوە درۆیەکی لەسەریەك کەڵەکە کراوە. هەندێك جار ئەو بەناو فریادڕەسانە لە خەڵکە ئاساییەکە درندە و شەڕانگێزتر بوون.
- کەس لە مرۆڤ بە تواناتر نییە، کەچی بۆ دابین کردنی ژیان و ئاسوودەیی خۆی زۆر کۆڵەوارە.
- توانای بنیات نانی زۆرە، بەڵام حەزی وێران کردنی لە کێشا نییە.
- ئای! ئەی چار؟
- بۆ ئێستا چار هەر ئەوەیە بیر لە ڕزگاربوونی خۆمان بکەینەوە، تا زووتر چاکتر.
- هەر من و تۆ نا، ئەم لاوە نەگبەتەیش.
- باشە، دەڵێن ڕێویی خۆی بە کونەوە نەدەچوو هەژکێکیشی بە کلکیەوە بەست!
سەرمەد گوێی لە گفتوگۆکەیان گرتبوو، تێ نەدەگەیشت، بەڵام هەستی دەکرد باسی شتێکە پەیوەندی بە بەوەوە هەیە.
هەرسێکیان هەستان، بە ناو درەختەکاندا گەڕان، کەوتنە خواردنی چوالە و هەرمێ کێویلە و هەنار و هەنجیر و گوێژ و ترێ. سەرمەد وەك یەکەمجاری بێت شوێنی وای دیبێت یان هەر ئێستا لە دەست مەرگ ڕزگاریی بووبێت، بە تاسەوە دەگەڕا و میوەی دەکردەوە، تەنانەت ئاگای لەوە نەمابوو کە ئەم دەست بەسەرە و دەشێت دوانەکەی تر چی لەبارەوە بڵێن.
کە بۆ حەسانەوە دانیشتنەوە دلێر وتی:
- خەونە سەیرەکەت هەر نەگێڕایەوە، ئەوەی تیایدا بووبوویت بە شاعیر؟
- هەر شاعیر نا، گۆرانی بێژ و حیکایەتخوانیش، ناتوانم لە یەکتریان جیا بکەمەوە. دەڕۆیشتم و هەندێك جار لەبەر خۆمەوە و جاری تر بە دەنگی بەرز کۆپلەکانم دەوتەوە.
- لە بیرت نەچێت لە تەنگژە و قەیرانە گەورەکاندا زۆرجار مرۆڤ هەر فریای دواندنی خۆی دەکەوێت، مەبەستم گەڕانەوەیە بۆ خودێکی ڕووت و قووت کە زمانی ئاسایی توانای جڵەوکردنی نییە.
- تێت ناگەم!
- کاتێك مرۆڤێك لەوەدایە لە ڕووبارێکدا بخنکێت بیر لەچی دەکاتەوە؟
- بێگومان لە خۆ ڕزگارکردن.
- واتا هیچی تر نا، هەرچۆنێکە دەیەوێت نەخنکێت.
- بێگومان.



- زۆرجار تۆیش کاتێك چیرۆکی خۆت تەنیا بۆ خۆت دەگێڕیتەوە، بۆ ئەو نەخنکانەیە. چونکە چیرۆکی وات هەیە ئەگەر هەر هیچ نەبێت بۆ خۆتی نەگێڕیتەوە لەوانەیە شێت بیت، بە تایبەتیی لە هەندێك کاتدا.
- ڕاستە، چیرۆکی وایشت هەیە ئەوەندە قێزەونە حەزناکەی بۆ خۆیشتی بگێڕیتەوە، وایە؟ ئێستا گوێم لێ دەگریت؟
- بێگومان، تەواو ئامادەم.
- لە خەوما ئێمە مەفرەزەیەکی چەکدار بووین و بەرەو شەڕگایەك دەچووین، هەڵس و کەوتمان لە مرۆڤی ئاسایی نەدەچوو، تۆ بڵێ ئەگەر زۆرت وردبکردایەتەوە هەندێکمان لە شێت دەچووین.
- هەروایشە، لە شەڕدا نیوەی ئەقڵ دەدۆڕێت و نیوەکەی تری لەوە شپرزەترە پشتی پێ ببەستیت.
- یەکێك دڕدۆنگ و تووڕە، ئەویان لەبەرخۆیەوە ورتە ورتی دەکرد و هەندێك جار پێ دەکەنی. دوان گۆرانیەکی خەمگینیان بۆ یەکتر دەسەندەوە و هەیش بوو وەك برسی بێت و بەرەو خواردنێکی خۆش بچێت بە پەلە دەڕۆیشت. چەند جارێکیش یەکێکمان لە خۆیەوە دەبوورایەوە. بەڵام لەگەڵ بینینی ئەو دیمەنانەدا خۆیشم ببومە بەشێك لەو دنیا سەیرە.. شتێکی سەرسووڕهێنەرم دەوت..
- زۆر ئاساییە بە ئاگابیت و وڕێنەیش بکەیت.
- نا، بە پێچەوانەوە شتێکم دەوت لە نێوان شیعر و حیکایەتدا بوو، دەموت و نەم دەبڕیەوە، کە زانیم هەموویان گوێیان بۆ هەڵخستووم زیاتر دەنگم لێ هەڵبڕی. گوێ بگرە بزانە چیم وتوە:

« ئێمە دەڕۆین و ناگەڕێینەوە
ئەگەر هەبێت بگەڕێتەوە ڕێگاکەی دوور و سەختە
شار و گوندمان پڕدەبن لە قەلەڕەشکە و کوندەبەبوو
ئەوانەی جاران ناسیبومانن ئەوان نامانناسنەوە
تەنانەت ئەو سەرزەمینەیش کە خۆمان بۆ دابوو بە کوشت
نەفرەتمان لێ دەکات...

- ئەمە گۆرانییە، شیعرە، یان دەردەدڵی ڕاستەقینەی خۆتە؟

(ئەوەی دەگەڕێتەوە
بە درێژایی ڕێگا دوورەکە گۆڕ دەبینێت
گۆڕستانێکی دوور و درێژ
سەر گۆڕەکان لە باخچە دەچن
گوڵی سوور و زەرد و ئەرخەوانی داپۆشیون

گوڵەکان بۆنیان لێ نابڕێت و
چوار وەرزین
ئیتر ڕێگا هەر گۆڕە و گۆڕە و گۆڕ.
ئەو دەوەستێت و چاو دەگێڕێت
بەدوای گۆڕی هاوڕێ و دۆستەکانیدا دەگەڕێت
ئەوانەی ڕۆژێك لە ڕۆژان هەناسەیان تێکەڵ بە یەکتربووە
شەوانە لە سەرما و برسیەتیدا دەستیان لە ملی یەك کردوە و
خەوێکی مردوانەیان لێ کەوتوە
بەڵام هیچیان وەگیرنایەت
چونکە گۆڕەکان بێ شوناسن
تەرمەکان پێکەوە نێژراون
کەس نازانێت کێن و لە کوێوە هاتوون
لەوانەیە دوژمنێك و دۆستێك
شۆڕشگێڕێك و ناپاکێك
سەربازێك و پێشمەرگەیەك
لەناو گۆڕێکی زۆر تەنگەبەردا
پێکەوە نێژرابن
لەوانەیە زۆرێك لەو سەربازانەیان تیابێت
کە بەوێدا تێپەڕیون و
هەمان گۆرانیی ئێمەیان چڕیبێت
کێ چوزانێت!
لەوانەیە لەوکاتەدا کوێرێك
تەنیا کوێرێك
بە گۆچانەکەیەوە بە ناو گۆڕەکاندا بێت و بچێت
لەسەر هەر گۆڕێك هەڵوێستەیەك بکات
بوەستێت و چەندجارێك بە گۆچانەکەی لە کێلەکان بدات
تا لەسەر گۆڕێك ڕادەوەستێت و ڕادەمێنێت
ڕامانی جەستەیەکی پەژموردە لە ڕۆحێکی سەوز
یان ڕامانی ئاسۆیەك لە خۆرێکی تازە گیراو
ئەو ڕاماوە و دوودڵە



لە پڕێکدا دادەنیشێت و سڵاوێك لە گۆڕەکە دەکات
تۆ نازانیت سڵاوەکەی بە کام زمانە
چ زمانێکی ئەم سەرزەمینە
بەڵام وردە وردە تێدەگەیت ئەوە گۆڕی تاقە کوڕەکەیەتی
کە چەند ساڵێکە بۆی دەگەڕێت و نایدۆزێتەوە
کوێرەکە دەست بەسەر کێلەکەیدا دەهێنێت و بێدەنگە
لەوە سەرسامترە بتوانێت هیچ بڵێت
دەست لە خۆڵ و خاکەکەی وەردەدات و بۆنی دەکات
ئیتر وەك تەواو دڵنیا بووبێت کێلەکە ماچ دەکات و
لە خوا دەپاڕێتەوە.

بە درێژایی ڕێگا بێ کۆتاییەکە
لە هەموو شوێنێکی گۆڕستانەکەدا
تابلۆیەك هەڵواسراوە
لێی نووسراوە (گۆڕستانی س)ەکان.

سەری جەنجاڵی دلێر بوو بە گوزەرگای جیاجیا، نەفرەت، دڵەڕاوکێ، مەرگ، شارە خاپوورەکانی دنیا، مرۆڤە سەرزەدەکانی مێژوو، لەشکری بێ کۆتایی شکست و نغرۆبوون، کەنیزەکە بێ ئەژمارەکانی حەرەم، گۆڕی بێ شوێنەواری پاشاکان و مەزاری هەژارە کولبەنشینەکان.

دلێر بە سالاری وت: بەڵام ئەم خەونەی تۆ بێ کۆتاییە، هەموومان دەیبینین و ڕەنگە هەستی پێ نەکەین. من وادەزانم ئەو کوێرە بە گۆچانەکەی لە دەرگای ماڵی من و تۆ دەدات و ئێمە دەرگاکانمان داخستووە، ناوێرین بیکەینەوە، یان شەرم دەکەین و توانای ڕووبەڕووبوونەوەمان نییە. ئیتر هەرئاوا...

«.ئەو کەسەی دەگەڕێتەوە
بۆ ماوەیەك ئاهەنگی سەرکەوتنی بۆ سازدەکرێت
کچان شەیدای بینینیانن و شەوانە سەمایان بۆ دەکەن
ئەوان خۆیان بە شکۆمەند و پیرۆز دەزانن
بە مەستی سەری ڕێز بۆ ئەو فیشەکانە دادەنەوێنن
کە بە خەڵکی تریانەوە ناوە و کوشتوویانن

لەوانەیە سەردەمانێك هاوڕێی خۆشەویستی خۆیان بووبێتن
ئەوان لەوە بێ ئاگان
یان هەر هەستی پێ ناکەن
کە دەشێت یەکێك لە فیشەکەکانیان
لاوێکی جوامێریی پێکابێت
لاوەکە نەی زانیوە ئەو جێگایە کوێیە
ناوی چییە، بۆ هێنراوەتە ئەوێ
ئەی بۆ ئەوانی دی دەیانەوێت بیکوژن؟
ئەو دڵی پڕبووە و نەیوێراوە بگری
حەزی کردووە چیرۆکە بەجێماوەکانی
بۆ هاوڕێکەی تەنیشتی بگێڕێتەوە
باسی تاقانەیی خۆی
تیپی فوتبۆڵێنی
هاوڕێکانی قوتابخانەی بکات
لە دواییشدا هەر ئەو لاوە.
بە درێژایی ئەو شەو و ڕۆژانەی لە سەنگەردا بووە
تەقەی نەکردبێت و
دواییش جێگاکەی تەڕبووبێت.

دلێر وتی: بەڵام من و تۆ تەقەمان لە بەرانبەرەکانمان کردووە!
- دەزانم، خۆ منییش باسی بە فریشتەبوونی خۆم و خۆت ناکەم. بەڵام سەیر ئەوەبوو من هەر نەم دەبرِیەوە، تا دوایی ئەوەی دەم وت بوو بە قسەی ڕووت.
- چۆن؟
- (ڕەنگە من و تۆ جارێکی تر بەم ڕێگایەدا بێینەوە وەلێ نە هەست بە سەرکەوتن بکەین نە بە دۆڕان، نا، لەوانەیە لەوپەڕی سەرکەوتندا هەر دۆڕابین، چونکە شەڕگەکان لە بەرچاوماندا بێجگە لە شەرمەزاریی تۆوی جوانییان تێدا نابینین. ڕەنگە تۆ منداڵەکەت نەناسیتەوە، ئەگەر بیشی ناسیتەوە ئەو گاڵتەت پێ بکات، چونکە نە من و تۆ لەوان تێ دەگەین نە ئەوان تاقەتی گوێ گرتنی چیرۆکی کۆنی ئێمەیان هەبێت.
دلێر دوای کەمێك ڕامان لەسەرخۆ وتی:
- بەڕاست تۆ چۆن ئەم هەموو شتانەت لەبیرماوە؟



- ئیتر ئەمەیان سیحری خەونێکە ناتوانیت نەیسەلمێنیت.
- بەڵام ئەوەی تۆ وتووتە هەناسەی غەمگینی هەموومانە، لە سەرەتای بوونەوە تائێستا، لەم پەڕی دنیاوە بۆ ئەوپەڕی، هەناسەیەکە بەردەوام هەڵی دەمژین و کۆتایی نایەت.
- من پێویستم بە خەو و خەونی زیاتری لەم بابەتانەیە.
- چاکە، ئەوی تری بە قسە دەبەینەسەر، هیچی ترت پێ ماوە؟
- بێگومانم لەمانە زیاتر بوون.
- ئەوەی تۆ لە خەونا دیوتە کۆمەڵێك پرسیارمان تیا دەوروژێنێت: ئێمە لێرە چی دەکەین؟ ئایا ئەمە هەوڵێکی بێ هودانە نییە بۆ ئایندەیەکی چاکتر؟ تۆ بڵێی لە ناوەوەماندا ڕقێك، تۆڵەیەك، نەخۆشییەکی دەروونی خۆی حەشار نەدابێت و بیەوێت خۆمان و ئەوانی تریش هەلاهەلا بکات؟ ڕقێك گیرۆدەی بووبێتین و سەرچاوەکەی نەزانین! ئەمە غەدرێکە خۆمان بە ئارەزوویەکی ڕەهاوە هەڵمان بژاردوە یان لە پێکهاتەکەماندا ئۆرگانێکی چالاکە؟ ئەگەر وابێت دەشێت مرۆڤایەتی سووکترین بەها و بەرهەمی کارمان بێت!

هەردووکیان بێدەنگبوون و پاشان دلێر وتی:

- ئایا ئێمە دەتوانین چەوتی و ناشرینیەکانی مرۆڤ ڕاست بکەینەوە؟ ئەگەر ویستێکی لەو بابەتەمان هەبێت خۆمان ناخڵەتێنین!
- من لە تەمەنێکی زۆر زووی خۆمدا چەند جارێك هەوڵی خۆکوژیمدا، وام هەستدەکرد ژیان دۆزەخێکە تا زیاتر لێی بچیتە پێشێ ئەو زۆرترت دەسووتێنێت. هەست کردن بە بەردەوامی بوونی دۆزەخێکی وا لەلایەکەوە گرنگە کە تۆ بۆ ئایندەیەکی سەخت و دژوار ئامادە دەکات. لەلاکەی ترەوە بێجگە لە خۆڕزگارکردن لە دەستی، یان با بڵێم بەرەنگاریی کردنی هیچ چاری تر نییە. بە تایبەتیی ئەگەر بڕوات وابێت کە مردی ئیتر هەموو شتێك کۆتایی دێت. بۆیە من ئەمەی دواییم هەڵبژارد. وەلێ پێش ئەوەی پەتەکە لە ملم بجەڕێنم یان فیشەکەکە بەسەرمەوە بنێم ڕووداوی سەیر ڕایان گرتم. باشە با لە تۆ بپرسم بۆ ئەنجامم نەدان؟
- من و تۆ زۆر نییە یەکتر دەناسین. بۆیە ناتوانم لەسەر ڕابوردووت هیچ بڵێم.
- با خۆم چیرۆکەکەت بۆ باس بکەم: یەکەمیان لەو ساتەوەختەدا کە لە ژوورێکی تەنیادا چوومە سەر کورسیەك و ویستم ئەڵقەی پەتەکە لە ملم بجەڕێنم، لەپڕا تەزوویەك بە لەشما گەڕا و کەوتمە لەرزین، بەرچاوم تاریك بوو لەسەر کورسیەکەوە کەوتمە سەرزەویی. کاتێك بەئاگا هاتمەوە نزیکەی سێ سەعات بوو لە هۆش خۆم چووبووم. خوشك و برا و دایك و باوکم دەوریان گرتبووم و دەگریان.
- دیارە ترساویت!
- وایە، ئەمە لێکدانەوەی خۆیشمە، خۆکوشتن ئیرادەی زۆر گەورەی دەوێت کە لە مندا نەبوو. دیاربوو من

شەرم پێ فرۆشتبوو!
- هەر ئەوە نییە، خۆکوشتن گەیشتنە بەو ڕاستیە کە ژیان لەوە پووچترە تۆ ئازاری بۆ بچێژیت و خۆتی بۆ ماندووبکەیت. گەیشتن بەو ڕاستیە کارێکی ئاسان نییە و ڕەنگە لە توانای هەمووکەسێکدا نەبێت.
- دووەم جار زۆر بە ئیرادەوە کارەکەم کردەوە، بێ ترس و بێ دوودڵی. فیشەکێکم خستە بەر لوولەی دەمانچەکەم و پەنجەم پیانا، کەچی نەتەقی!
- بۆ؟
- نازانم!
- دووبارەت نەکردەوە؟
- با، ویستم ئەو فیشەکە بدەمەوە و دانەیەکی تری بخەمە بەر، بەڵام جارێکی تر بە هەمان فیشەکە کۆنەکەوە لوولەی دەمانچەکەم لە دیوارەکە کرد و چرکاندم. دەزانیت چی ڕوویدا؟
- تەقی!
- بەڵێ.
- تازەت نەکردەوە؟
- نا. لەوکاتەدا هەستێکی قووڵ ڕۆحی داگرتم، هەستێك بڕواناکەم تا ئێستا، لەم هەموو کێشە و دژواریانەدا کە تووشیان هاتووم، جارێکی تر هاتبێتەوە بەلامدا. وەك دەنگێك لە جێگایەکی نادیارەوە پێم بڵێت: بەسە، ژیان شانۆیەکی گاڵتە جاڕییە، دەبێت لە نمایش کردنیدا کاراکتەرێکی بەهرەمەند بیت، ئەگینا لەوە ڕیسواتر دەبیت کە هەیت، هەرچەندە گەلێك جار کاراکتەری بەهرەمەندیشی هەر کردۆتە گاڵتەجاڕ.

دلێر هیچی نەوت، بە جووتە لە سەرمەدیان ڕوانی کە وەك لە هەموو قسەکان گەیشتبێت گوێی لێ گرتبوون. سالار کیسە خەوەکەی کردەوە و خۆی خزاندە ناوی، سەرمەد نەیزانی چی بکات، چاوی بەلای هەردووکیاندا گێڕا، تا دلێر پێی وت با ئەوییش بخەوێت. بەڵام بە سالاری وت لە نیوەی شەودا هەڵی دەسێنێت و دەبێت بڕۆن.

*

تاریکە شەوێکی پاییز و هەوایەکی سارد. لای ڕاست دۆڵیانێکی قووڵی بێ کۆتا و لای چەپ دەشتێکی هەتەر. بەرانبەرییش ڕێگایەکە وردەوردە بەرەو لاپاڵ و بناری چیایەك.
دەبوو ئەو سیانە بەو ڕێگایەدا هەڵکشێن بۆ ئەوەی بە ڕووکاری ئەودیوی چیادا شۆڕ ببنەوە و لە مەترسیی ڕزگار بن. دەبوو بەرودوا بە پارێز و بێ چرکە هەنگاوبنێن. سالار بە پێی شارەزایی پێشتری لە پێشەوە دەڕۆشت، سەرمەد لە ناوەڕاستا و دلێر لە دواوە. خەمی ئەو ساتەیان تەنیا گەیشتنە ناو ڕەوەز و تەلانەکان بوو کە زیاتر دڵنیایی پەناگرتن و گەیشتنی دوا هەواری دەدانێ. سالار زۆر دەوەستا و هەستی ڕادەگرت، ئەوانییش لەگەڵیا چرکەیان لە خۆ دەبڕی و گوێ قوڵاغ دەبوون. سەرمەد یەکەمجاری بوو تووشی هەڵوێستی وا ترسناك ببێت، هەڵوێستێك دۆست و دوژمنی لێ تێکەڵ بێت و بە شوێنێکدا تێپەڕبێت لە هەردووکیان بترسێت. ئەو تەنیا ئەوەندەی پێ وترا بوو کە بەو چیا و دوندانەوە چەکدار هەیە و نە ئەمان دەزانن کێن و نە ئەوان دەیانناسن. سەرمەد بیری دەکردەوە کە هەرگیز بە خەیاڵیدا نەهاتووە بکەوێتە دنیایەکی واوە. دنیایەك بێجگە لە کەوتن و هەستانەوە، ترس و ماندووبوون هیچی تر نەبێت! ئەو لە ژیانێکی



ئاسوودە و بەختەوەرەوە، هاتۆتە دنیایەکەوە هەر هەنگاوێك و
تارمایی مەرگێکی کتوپڕ دەبینێت، لەناو گاڵتە و پێکەنینی هاوڕێکانیەوە
بۆ ڕێگایەکی هات و نەهات! ئەمە ئەو چیایەیە کە دوور بە دوور خۆشی
دەویست و ئێستا دەزانێت چ ئەهریمەنێکە! ئەگەر لە خەوندا ئەم دۆخەی بدیایە
لەوانە بوو شێت بێت. تۆ بڵێی جارێکی تر بگەڕێتەوە شارەکەی خۆی؟ کەمانچەکەی
بژەنێت و خوشکەکانی چەپڵەی خۆشی و ئافەرینی بۆ لێدەن؟ بیری لەوە دەکردەوە بڵێی لەم
شەوەدا، بەم چیا سەختەوە یەکێك هەبێت پێ بکەنێت یان گۆرانی بڵێت؟ نا. دنیاکە لەوە تاریك
و سامناکترە تیرۆژێك ڕووناکی تیاببینیت، دنیایەکی خامۆش بەڵام ترسناك. ئەی تۆ بڵێی ئێستاکە
کەسێك بیر لەم بکاتەوە؟ بۆ نموونە دایکی، باوکی، خوشکەزا جوان و قژدرێژە چاوشینە تەمەن سێ
ساڵەکەی کە لەباتی سەرمەد پێی دەڵێت سەمرەد. ئەگەر ئێستا بزانن لەناو چ دۆزەخێکدام چی دەکەن؟ پەنا
بۆ کێ دەبەن؟ لەوانەیە وابزانن جێگاکەی خۆشە و خۆزگەی پێ بخوازن! کێ چوزانێت؟ بڵێی ئەمشەو دایکی
خەوی پێوە نەبینێت؟ بەڵام ئەگەر مام، ڕۆژێك لە ڕۆژان باسی ئەمشەوە بۆ هەموویان دەکەم. شەوێك ژیانی
منی لەتکرد، بە تەواویی لەتیکرد. تەنانەت بیر و بۆچوونەکانمی گۆڕی.

دەنگی پۆلێك قاژوو کە بەسەریاندا تێ پەڕین هێنایەوە سەر خۆی، هەرچەند دەنگێکی ناخۆشبوو بەڵام
وزەی ئاوەدانی و ژیانی پێ بەخشینەوە. باران نمەی دەکرد و جارجار هەورەتریشقەیەك کە ئەو ناوەی
ڕووناك دەکردەوە دەی خستنە سەر چۆك. لەو کاتانەدا بە ناچاریی لە جێگاکەی خۆیاندا دادەنیشتن و مات
دەبوون، یان بە تەواویی لەسەردەم دەکەوتن و خۆیان بە زەوییەوە دەقرساند. دۆخەکە لە خۆ مەڵاس دانی
دوو گیانداری کێوی دەچوو کە بێ ئەوەی خۆیان ویستبێتیان ڕووبەڕووی یەك بووبێتنەوە، هەریەکەیان لە
ترسی ئەوی دی نە بتوانێت بڕوات و نە بوێریی پەلاماردانی هەبێت. ئەگەرچی کش و ماتیەکە گومانی
زۆری لا دروست کردبوون و وایان هەست دەکرد لەوانەیە لە چاوتروکانێکدا ڕووبەڕووی مەرگ ببنەوە.
بەڵام سالار لەوە بێ حەوسەڵەتر بوو جارێکی دی و بە هەمان ڕێگادا بگەڕێتەوە ناو دارستانەکە
و خۆی بداتەوە دەستی قەدەر. بۆیە بۆ دواجار وەك بڕیارێکی لەناکاوی دابێت، تەواو خۆی ڕاست
کردەوە و هەنگاوی گورجتری نا، سەرمەد بێجگە لە لاسایی کردنەوەی ئەو چی تری نەدەکرد.
هەنگاوێك و هەنگاوێکی تر و لەپڕا لە بەرپێی سالاردا مینێك تەقیەوە و دنیا مات و کڕەکەی
شڵەقاند. گڕێك بەرز بوەوە و ئیتر کوێرانە لە هەموو لایەکەوە بوو بە دەست ڕێژ. بەتایبەتیی بەرەو
شوێنی تەقینەوەکە. دلێر تەواو خۆی بە زەویەکەوە نووساند، چەند جارێك لەناو گەرمەی تەقەکاندا
بانگی سالاری کرد و هیچی نەبیست. تەنیا گوێی لە سەرمەد بوو کە بە زمانەکەی خۆی وتی کوژرام و
پاشان دەنگی بوو بە نووزەیەکی پڕ لە کرۆزانەوە و تا بەتەواویی کپ بوو. دلێر زانی هیچی بۆ ناکرێت و
مانەوەییشی لەوێدا بێجگە لە مردن بە چی تر ناگات. تەنانەت بواری ئەوەی نەبوو چەکەکەی سەرمەدیش
هەڵبگرێت کە دەیزانی لە نزیکیایەتی. وردە وردە بەرەو داوێنی چیاکە خۆی بەکێش کرد تا هەرچۆنێك بوو

گەیشتەوە سەر ئەو ڕێگایەی کە سێ سەعات لەوەوبەر سێ کەسی پێداهاتبوون و وا ئێستا تەنیا یەکێکیان ماوە.
*

دوای ساڵانێك، دلێر پەیجوریەکی سەوداسەرانەی بۆ دۆزینەوەی ئاسەواری سەرمەد و سالار کرد و بێ ئاکامبوو. بەدوای شوناسی ئەوانەیشدا گەڕا کە ئەو شەوە کۆتاییان بە تەمەنی ئەو دوانە هێنا و بە تەواویی دنیایشیان لەبەرچاوی ئەمدا تاریك کرد، لەمەیشا سەرنەکەوت. بەڵام بە ئاسانی ئەو گۆڕستانە هەرە گەورەیەی دۆزیەوە کە سالار لە خەونەکەیدا بینیبووی و تا ئێستایش بەردەوام تەرمی تازەی تیا دەنێژرێت.

ئەیلوولی ٢٠١١





# من و کامێراکەم

ئارام کاکەی فەلاح

(١)

هەمووی لەو ڕۆژەوە دەستی پێکرد، کە من بە خۆم و خولیاکانمەوە، بەخۆم و خەیاڵە شێتەکانمەوە بریارمدا بە پارەیەکی زۆر کە ساڵانێك دەبوو کۆمکردبوونەوە کامێرایەك بکرم و بە چەپ و ڕاستدا بکەومە وێنەگرتنی هەر شتێك بێتە بەر چاوم. بیهێنە بەرچاوی خۆت هەر شتێك دەجولێتەوە، بەچرکەیەك دەست دەنێی بە دوگمەیەکداو لە شوێنی خۆی بۆ هەتا هەتایە دەیوەستێنیت. ئەو چرکەیە بۆ هەتا هەتایە دەژی، تۆ دەڕۆیت و ئەو دەمێنێتەوە. ئەو وێنەیەی تۆ لەچرکەیەکدا دروستی دەکەی، لە کاتێکی تردا، لە زەمەنێکی دوورتردا بێ ئەوەی پێ بزانی ئەو تۆ دروست دەکاتەوە.

جا ئەو رۆژەی من کامیراکەم کڕی تەنها شتێك لە خەیاڵمدا بوو ئەوە بوو هەموو شتێك لە شوێنی خۆی بوەستێنم، زەمەن تەنها لە وێنە و لە عەشقێکی قووڵدا دەوەستێ، جا چونکە من قەت تووشی عەشقێکی قووڵ نەبووبووم بۆیە هەستم بە وەستانی زەمەن نەدەکرد، جا هەوڵمدا لەناو وێنەکانەوە زەمەن بوەستێنم. کە منداڵ بووم هەمیشە بەو وێنانە سەرسام بووم کە لەساڵەکانی زۆر زوودا گیراون و کەسەکان و شوێن و شتەکان زۆر بە ڕوونی دەبینران و منیش بە سەعات سەیرم دەکردن و تێر نەدەبووم. ئەوەی جێگای پرسیار بوو لای من، ئەوەبوو چۆن هەموو شتێ بە زەمەنیشەوە لەناو کاغەزێکدا دەیبەستێ؟ هەمیشە وێنە و ئەلبوومەکانم بە یارییەکی فێڵزانانەی ژیان خۆی لەگەڵ مرۆڤدا دەهاتە بەرچاو، یارییەك کە هەموومان تێایدا بەشدارین و بە یاسا دڕندەییەکانی ڕازین.

(٢)

نا، هەمووی لەو رۆژەوە نەبوو، بەڵکو زیاتر ئەو کاتە بوو کە من بە خۆم و گرفتەکانمەوە، بە خۆم و نەگبەتییەکانمەوە چوومە لای دکتۆرێکی دەروونی و لەبەر دەمیدا کز و شرۆڵە وەستام و بەدەنگێکی نزم کە نەمەوێ تەنانەت خۆشم گوێم لێبێ وتم: دکتۆر گیان من نەخۆشم، دکتۆریش وەك کەسێکی بەئەزموون کە لەسکی دایکیەوە دکتۆر بوو بێت و بە سەرو سیمای کەسانی وەك من راهاتبێت، بزەیەکی کرد و وتی: جا کێ نەخۆش نییە؟ لە تاودا پێکەنیم و یەکسەر زانیم کە دکتۆر بۆیە وای وت تا من زیاتر بکرێمەوە و بتوانم باشتر باسی رۆحی زامداری خۆمی بۆ بکەم. وتم دکتۆر گیان! من ماوەیەکی زۆرە نەخۆشم و بەخۆم نەزانیووە. وتی: زۆر ئاساییە. هەموو نەخۆشییە دەروونییەکان وان و وەك نەخۆشی تر نین، لەسەرەتادا کەس نازانێ کە نەخۆشە تا ماوەیەکی زۆر تێدەپەڕێ. بەڵام فەرموو پێم بڵێ چیتە؟ وتم دکتۆر، من بوونەوەرێکی سەیرم، سەرلەخۆم دەرناکەم، وەك هەزار دەرگای نەبینراوم بۆخۆم دروست کردبێ و هەر خۆشم کلیلەکانیم فڕێ دابێتە قورگی دەریاوە، ئاوام. وتی چۆن، مەبەستت چییە؟

(٣)

نا، هەمووی لەو ساتەوە دەستی پێکرد کە من بەخۆم و کامێراکەمەوە، بەخۆم و وێنەکانمەوە، لەبەردەمی بەڕێوەبەری پۆلیسدا وتم، من دەزانم کێ کچەکەی هەفتەی پێشووی کرد بە ژێرەوە و بۆی دەرچوو.

(٤)

لە ڕاستیدا خەونی من کڕینی کامیرایەك بوو بتوانم بە هۆیەوە ڕۆحی دیمەنێك بە هەموو قورسایی خۆیەوە بگوازمەوە. هەمیشە خەیاڵێك مەستی کردبووم، ئەویش ئەوە بوو کە دیمەن لەو وێنەیە گرنگترە کە دەیگرین چونکە هەمیشە تەعبیر لەساتی ئێستا دەکات و ڕەسەن و ئوریگیناڵە، بەڵام وێنەکان هەمیشە تەعبیر لە کاتێکی ڕابردوو دەکەن، کاتێك کە تێپەڕیووە و مردووە و هەرچەند بکەین بۆمان نابنەوە بە ژیان، بەڵام بە تێپەڕبوونی کاتێکی زۆر وێنەکە دێت و جێگای دیمەنەکە دەگرێتەوە، ئەوکاتە دیمەنەکە دەمرێت و وێنەکە وەك تاقە شایەتێکی خۆی بۆ ژیان بەکاردێنێت.

(٥)

وتم : دکتۆر من بە هەزارەها چاڵم بۆ خۆم هەڵکەندووە، ڕۆحم بە سەدەها بەندیخانەی بۆ خۆی دروست کردووە. ڕۆژ نییە خۆم نەخەمە بەر گرانترین تاقی کردنەوە، تاقیکردنەوەیەك کە هەر پێویستیشم پێ نییە. دکتۆر وتی: ئەمانەی تۆ دەیڵێیت زۆر گشتین، دەزانی بە سەدەها کتێب لەسەر بەندیخانەکانی ناو مرۆڤ نووسراون، سەدەها کتێب لەسەر ئەو چاڵانەی کە مرۆڤ بۆ خۆی دروست دەکات و نایبینێت، بەڵام ئەوە بزانە هیچ یەك لەو چاڵانە، هیچ یەك لەو زیندانانە لەیەك ناچن، بۆیە دەمەوێ بە ڕوونتر باسی ئەو چاڵانەم بۆ بکەیت کە دەکەویتە ناوی.

(٦)

بەڕێوەبەری پۆلیس بە گومانی پیاوێکەوە کە ئیشی زۆری لەو بوارەدا وای لێ کردبێ بە ئاسانی بڕوا بەکەس نەکات، سەیرێکی هەردووکمانی کرد و وتی، دەبێ ئەوە بزانی کە تاوانبارکردنی کەسێکی دیاریکراو بە بێ هیچ بەڵگەیەك توشی کێشەت دەکات، منیش لاپەڕەی ڕۆژنامەکەی هەفتەی پێشووم لەسەر مێزەکەی کردەوە و وێنەی کچەکەشم لە باوکی وەرگرت کە لەتەنیشتمەوە دانیشتبوو، وتم ئەمە ئەو کچە نییە کە هەفتەی پێشوو کرا بە ژێرەوە؟ وتی با، وتم ئەمەش دەناسی باوکی کچەیە و چەند ڕۆژ پێش ئێستا وەك خۆی پێی وتم، باسی ئەو ئۆتۆمبیلەی بۆ کردن کە بەو بەیانییە زووە کاتێ کچەکەی لە نانکڕین دێتەوە لە نزیك ماڵی خۆیانەوە دەیکات بە ژێرەوەو بۆی دەردەچێت. وتی وایە، وتم باوکی لەو ساتەدا لەحەوشە دەبێ گوێی لە ئۆتۆمبیلێك دەبێ کە یەکێك دەکات بەژێرەوەو بۆی دەردەچێ، تەنها فریای ئەوە دەکەوێ بێتە دەرەوەو بزانێ چی ڕووی داوە، سەیارەیەك دەبینێ وەك تیر دەردەچێ و بەو شڵەژاویەوە کە کچەکەی دەبینێ تەنها ڕەنگی سەیارەکەی لە خەیاڵدا دەمێنێتەوە، تۆش پێیت وتووە : ئاخر خاڵە گیان من ناتوانم خاوەنی هەموو ئەو سەیارانە بگرم بەو ڕەنگەوە کە تۆ باسی دەکەیت.، بەڵام ئێستا دەتوانی بیگریت، بەڕێوەبەر وتی چۆن؟



(٧)

بۆ نموونە کە وێنەی گوڵێکم دەگرت و دەمشتەوە، تەنها شتێك لە
خەیاڵمدا گواستنەوەی رۆحی گوڵەکە بوو بۆ ناو پارچە کاغەزێك. دەهاتم
و پەڕی گوڵەکەم بە وشکی بۆ ماوەیەکی زۆر لەسەر وێنەکە دادەنا، ئینجا لە
چەند دڵۆپێك ئاوی تایبەتیدا پەڕەکانم دەکوڵاند و بە چەند دڵۆپێك کە لێم دروست دەکردن
وێنەکەم گولاوپرژێن دەکرد، بۆیە هەر کاتێك سەیری وێنەکەت دەکرد بۆنی گوڵەکەش بۆ چەند
چرکەیەك وەك ئەفسوونێکی لەناکاو بەسەرتا دەهات، هەر لەخۆتەوە بێ ئەوەی پێ بزانی وێنەکەت
لە لووتت نزیك دەکردەوە، کەس نەیدەزانی ئەو عەترە لەکوێوە دێت. بەو شێوەیەش هەمیشە ئەو
گوڵەی ناو وێنەکە زیندوو دەمایەوە و زەمەن زەفەری پێ نەدەبرد، چونکە نە وێنەی گوڵەکەی پێ لەناو دەبرا
و نە بۆنەکەی. یان بەهەمان شێوە کاتێك وێنەی تەنەکەیەکی خۆڵم دەگرت، وێنەکەم بۆ ماوەیەك دەخستە
ناو تەنەکەی خۆڵەوە تا بۆنێکی بۆگەنیی دەگرت و هەر کەسێك سەیری بکردبایە لەخۆیەوە بزەیەکی دەکرد
و نەیدەتوانی پرسیار نەکات، ئەوە بەراست بۆنی ناخۆشی لێ دێ، ئەوە چۆن؟ ئەم بۆگەنییە لەکوێوە دێت؟

(٨)

دکتۆر! من گەورەترین دوژمنی خۆمم لەسەر ئەم زەمینە، رۆژێك نەمبینی بەقسەی خۆم بکەم، ئێوارەیەك
نەبوو قۆڵ بکەم بە قۆڵی خۆمدا پیاسەیەکی تەنیا و خۆش لەگەڵ خۆم بکەم. قەت بەدڵی خۆمم نەکردووە،
دەچم بۆ بازاڕ و خراپترین و ناشرینترین کراس لە دونیادا بۆ خۆم دەکڕم. سەیری پانتۆڵەکەم بکە،
تووخوا زەلام هەیە لە دونیادا پانتۆڵی وا بکڕێ؟ من دەبێ هەمیشە بۆ ماوەی دە چرکە لە دوای
داخستنی دەرگای دەرەوە چاو بنووقێنم، دەنا ناتوانم ماڵ بەجێ بێڵم و بچمە دەرەوە، گەر وا نەکەم
هەموو رۆژەکە دڵم لای ماڵ دەبێت و هەست دەکەم شتێکی ناخۆش روو دەدا. تێل بۆ هەر کەسێ
بکەم و وەڵام نەداتەوە یەکسەر هەست دەکەم شتێکی لێ هاتووە، بۆیە هاورێ خۆشەویستەکانم
هەمیشە گلەییم لێ دەکەن کە تێلیان بۆ ناکەم، ئەوە هی ئەوەیە نەوەك وەڵام نەدەنەوە. قەت
ناتوانم دوو جار لە رۆژێکدا بە هەمان رێگادا بڕۆم، چەند جارێك بە هەمان رێگادا رۆشتووم و
کەوتووم و قاچم شکاوە یا ن لە جێ چووە. گەر بە پاس بڕۆم، ئەوا دەبێ چاوەڕێی سێیەم پاس
بکەم و ئینجا سوار ببم، بۆیە هەمیشە دوا دەکەوم، گەر پاسی یەکەم و دووەم بگرم ئەوا بێ شك شتێك
روودەدا، سەیرت لێ نەیەت گەر بڵێم چەند جارێك خراپ بەر پاس و ئۆتۆمبیلی تر کەوتووین و خەڵکێکی
زۆر بە هۆی منەوە تووشی کێشە بووە و هەستێکی زۆر بە گوناح بە هەفتە ژیانی منیان کردووە بە دۆزەخ
و نەموێراوە بە پاسەکان بڕۆم و بە سەعات بە پێ رۆشتووم تا پێویستم بە پاس نەبێ و تا کەس تووشی

گرفت نەبێ. گەر شتێکم لەماڵەوە بیر چوو، گەر گەڕامەوەو دەرگام کردەوە تا بیهێنم، ئەوا دەبێ لە ئاوێنەدا سەیرێکی خۆم بکەم و مۆرەیەك لەخۆم بکەم، گەر وا نەکەم ئەوا رەنگە دز بێتە ماڵم. یان کلیلەکانم لەبازاڕ لێ بکەوێت. بڕوا بکە چەند جار بیرم چووە سەیری ئاوێنە بکەم و مۆڕە بکەم بۆیە کلیلەکانم ون کردوون و نەمدۆزیونەتەوە. کە نان دەخۆم دەبێ شەش جار نانەکەی دەمم بجووم ، گەر پێنج بێت یان حەوت، هەست دەکەم لە قوڕگم دەگیرێت و دەمکوژێت، ئەو رۆژە نانەکەی وا خۆش بوو، حیسابم لێ تێك چوو بەجۆرێك لە بینم گیرا وا زەرد و بێ ڕەنگ بووم دەتووت دە کەس دەستیان خستۆتە بینم و دەمخنکێنن، خۆشم نازانم ئەم حیساب و کیتابە بۆ دەکەم و بۆ پارووەکانم دەژمێرم و خواردنەکەم لێ دەبێتە دەرد، ئەمە چ نەخۆشییەکە؟

(٩)

بەڕێوەبەر لەناکاو هەستاو لە سەلاجەیەکی بچووکی ژوورەکەی، دوو ئاوی ساردی هێنا و لەبەر دەم من و باوکی کچەدا دانیان و دانیشتەوە، منیش کامێرا دیجیتاڵییەکەم لەناو جانتاکەدا دەرهێنا و وێنەی ئەو ئۆتۆمبیلەم بە ژمارەکەشییەوە پیشاندا، تەنانەت خاوەنەکەشی کە لێی دەخوڕی زۆر بە روونی دیار بوو. دە وێنەیەك دەبوون پێنجیان وێنەی کچەکە بوون لە کۆڵانی خۆیانەوە بە نانی گەرمەوە بەرەو ماڵ دێتەوەو خەریکە دەگاتە ماڵەوە، پێنج وێنەکەی تریش کە خولەکێك و چل و چوار چرکە دوای ئەوە گیراوە، وێنەی ئەو ئۆتۆمبیلە بوو کە زۆر بە خێرایی لە کۆڵانەکەوە دێتە دەرەوەو ئەوسا من لەسەر شەقامەکە بووم و ئەو بەبەردەممدا زۆر شێتانە تێ پەڕی. هەر فریا کەوتم لەو ساتەدا ئەو پێنج وێنەیەی بگرم.

(١٠)

من ماوەی ئەم چەند مانگە کە ئەم کامێرایەم کریووە، بە هەزارەها وێنەم گرتووە و وێنەیەکی تیا نییە رۆحی دیمەنەکەم نەگواستبێتەوە، دەمەوێ ببمە فۆتۆگرافەرێك هیچ نەبێ دوای خۆم ئەلبوومێك جێ بێڵم یادم بکاتەوە، ئێستا لەم شارەدا ژمارەی فۆتۆگرافەرە خراپەکان لە شاعیرە خراپەکان زیاترن، بە زەوقێکی خراپەوە، بە کامێرایەکی خراپ، فلَق دەست دەنێن بە دوگمەیەکی خراپدا و وێنەیەکی خراپ دەگرن و دوای چەند چرکەیەك لە فەیس بووکدا دایدەنێن و بە سەدەها لایکی خراپیان بۆ دێت. بەڵام من وا ناکەم، من وێنەیەکم نەگرتووە پارچەیەك لە رۆحی خۆمی تیا نەبێت، وێنەم نەگرتووە بەشێك لە گلێنەی چاومی تیا بەجێ نەمابێت. من نازانم چ ئەلبوومێك جێ دێڵم، بەڵام ئەوە چەند مانگێکە وازم لە هەموو شتێك هێناوەو دونیام کردووە بە وێنە، هەموو شتێکم لەم شارەدا کردووە بە فۆتۆیەك و ماوەیەکی تر بەتەمام پێشانگایەك بکەمەوە، من چوومەتە هەموو شوێنێك تا وێنەیەك بگرم، بە پەنجەرەو دەرگاکاندا سەرکەوتووم، چوومەتە بەرزترین شوێن و سەر بەرزترین درەخت ولەدوورەوە وێنەی ئەو ژووری ئوتێلانەم گرتووە کە بە نهێنی گرێبەستی تیا دەکرێ و کەس ئاگای لێ نییە، وەرن بۆ پێشانگاکە و دەم و چاوەکان ببینن. بە دزییەوە سەرمێزی خواردنەوەی شەوانم گرتووە کە مرۆڤ و



ئەدەب و هونەری تیا هەراج دەکرێ. ئەو منداڵانەی کە بەبازارەکاندا
بڵاوبوونەتەوە و بەزۆر ئیشیان پێ دەکەن. وەرن و وێنەی هەموو
رووداوەکانی ئۆتۆمبیلم گرتووەو تا هەمووتان کلیلی سەیارەکانتان فڕێ بدەن،
ببینن لێخوڕینی سەیارە چەند ناشرینە لەم شارەی ئێمەدا. لە پەنجەرەکانەوە
ژووری پۆلەکانم گرتووە، تا هەموو ئەو قوتابییانە ببینن کە رۆژانە دەگرین، تا بزانن چەندە
ناشرینن زۆربەی زۆری مامۆستاکانی ئێمە. وەرن بۆ زانکۆ و ئەو مامۆستایانە ببینن کە حزبەکان
کردوونی بە مامۆستا، سەر بەژوورەکاندا بکەن و بزانن هەموو شتێکی تیایە زانست نەبێت.
ئەوانە ببینن کە بەدەستی پۆلیس کوژران، ئەو بەڕێوەبەرانەی کە پارەی دایرەکەیان دەخۆن، ئەو
فەرمانبەرانەی دوای رۆشتنی بەڕێوەبەرەکەیان تێی دەتەقێنن و دەچنە ماڵەوە. ئەوانەی موچە وەردەگرن
و ئیشیش ناکەن. ئەو دووکاندارانەی نرخ لەسەر کاڵاکانیان دانانێن تا بەگرانتر بیانفرۆشن. ئەوانە ببینن
کە لەسەر رای جیاواز بەر چەقۆ دەدرێن، ئەو برا بێ مێشکانەی لەسەر نامەیەك یان تێلێك خوشکەکانیان
دەکوژن. گەر دەتانەوێ ئەلبوومەکەم ببینن، وەرن، وەرن بۆ پێشانگاکەم.

(١١)

لەوانەش خراپتر، دوژمنایەتیم لەگەڵ خۆمدا گەیشتۆتە ئاستێك کە هەندێ حەب و دەرمان دەخۆم پێویستم
پێی نییە، حەبی زەخت و حەبی گەدە و شرووبی قوورگ. ماوەی مانگێك زیاتر دەستم بە پەتێك بەستبوو و
لە ملم ئاڵاندبوو وەك شکا بێت یان لە جێ چووبێت، بەڵام هیچم نەبوو، تەنها تاقیکردنەوەیەك بوو بزانم
بەرگەی دەگرم یان نا. بیرتە ماوەیەك پیش ئێستا چەند جارێك بەفر باری، دە من هەموو جارێ بۆ
ماوەی نیو سەعات بە تەنها شۆرتێکەوە لە حەوشە دەوەستم و خۆم رەق دەکەمەوە. ئەو رۆژە چووم
بۆ ریستورانتێك، پارەمدا و نانیشم نەخوارد. دەچمە حەمام و دەبێ شەش دەقیقەم پێ بچێ، یەك
چرکەی زیاتر بێت بە رووتیش بێت دێمە دەرەوە. ماوەیەك هەوڵم زۆر دا بە چاوی کراوەوە بنووم و
بۆم نەکرا. دوکتۆر گیان ! هەست دەکەم دوژمنێکی زۆر لەناو مندا خەوتووە و هەر رۆژەوە و چەند
دانەیەکیان خەبەریان دەبێتەوە و دێنە گیانم. پێم بڵێ چی بکەم؟

(١٢)

بەڕێوبەری پۆلیس زۆر بە وردی سەیری وێنەکانی کرد، پاش و پێشی کردن و دووبارە و دەبارە سەیری
کردنەوە و هەموو جارێکیش دەتوت یەکەمجارە سەیریان دەکات، من لای خۆمەوە هەر دە وێنەکەم کۆپی
کردبوون و ئەویش بەراوردی دەکردن و وتی، پێش ئەوەی هیچ بریارێك بدەم ، من چەند پرسیارێکم هەیە،

وتم فەرموو، وتی باشە بۆ بەم وێنانەدا دەبێ ئەم ئۆتۆمبیلە بێت؟ ئەی تۆ چۆن ئەم وێنانەت گرت؟ بەو بەیانییە زووە چیت دەکرد لەو کۆڵانەدا، وەك بزانی ئەم پیاوە یەکێك دەکات بە ژێرەوە چۆن هەر لەخۆتەوە وێنەیەکی وا جوانت گرتووە هەر دەڵێی سەیارەکە لە ژوورەکەدایە و کە لە پێشەوە سەیری دەکەم هەستێکم هەیە کە خەریکە منیش دەشێلێ. ئەم وێنە دەگمەنانە بە بێ هیچ ئامادەکارییەکی پێش وەخت چۆن دەگیرێن؟ هی ئەم کامێرا باشەیە یان سیحرێکی تریش هەیە بۆ گرتنی ئەم جۆرە وێنانە؟ وتم ڕاست دەکەی بەڕێزم، وەك دەبینی ئەمە کامێرایەکی باشە و هەموو ماڵ و موڵکم بۆ بەدەست هێنان و کڕینی دانا، بەڵام نەخۆشییەکی تایبەتی من لەپشت گرتنی ئەم وێنانەوە هەیە، نەخۆشییەکی دەروونی کە خەریك بوو بەرەو نەمانم بەرێ، کەمێکم مابوو بخنکێم تا خۆم گەیاندە دکتۆرێکی دەروونی و دوای چەند جارێك سەردان وقسە گۆڕینەوە لەگەڵیدا، پاش ئەوەی چیرۆکی خۆم و وێنە و خولیاکانم بۆ گێڕایەوە، پێشنیاری کرد کە باشترین چارەسەرێك بۆ من کە لەو نەخۆشییە سەختە ڕزگارم بێت، باشترین ڕێگا کە خۆم لە ئاژەڵە درندەکانی ناو ڕۆحم بپارێزم و هەوڵبدەم لەگەڵ زۆربەیاندا ئاشت ببمەوە، ئەوەیە کامێرایەك بکڕم و بە چەپ و ڕاستدا تەنها و تەنها بیر لە وێنە گرتن بکەمەوە و هەموو شتێکی تری ئەم دونیایە فەرامۆش بکەم، گەر توانیم ڕۆحی دیمەنەکان بگوازمەوە، ئەوا بێ شك دەتوانم ڕۆحی خۆشم چارەسەر بکەم. منیش هەر وام کرد، ئەو بەیانییەش یەکێك بوو لە ڕۆژە ئاساییەکانم، وەك حەب خواردنێك وا بوو بۆ تیماری دەردم. چونکە من ماوەیەکی زۆرە هەموو بەیانییەك سەعات پێنج زوو دێمە دەرەوەو وێنە دەگرم، ئەم شارە وەك تۆپێك وایە، هەر یەکێك دێت و شەقێکی تێ هەڵدەدا. ئای خوایە! ئەم شارە نەگبەتەی من تەنها بە بەیانیان جوانە، ئەو کاتەی زۆربەی خەڵك خەبەریان نەبۆتەوە. بۆیە هەمیشە حەز دەکەم بەبەیانیان زوو وێنەی بگرم، وێنەی شەقامە ناڕێك و ماڵە ناشرینەکان، دەرەختە وشکەکان و باڵندە برسییەکان. وێنەی بینا بێزەوق و کۆڵانە پیس و پۆخڵەکان. ئەو بەیانییە دوای سەعات شەش گەیشتمە کۆڵانێك، بە تەنیایی و هێمنی کۆڵانەکەوە هاتمە خوارێ، لەبەردەم بەرد و دەرگاکاندا دەوەستام و وێنەم دەگرت، لەدوورەوە کیژۆڵەیەکم بینی هێندە جوان هەڵمی نانە گەرمەکەی دەستی تێکەڵاوی چاوە خەواڵووکەی دەبوو، لە دوورەوە ئەو دەم و چاوە وەك تازە لە تەنوورەوە هاتبێتە دەرەوە وای لە من کرد پێنج وێنەیەك بگرم کە دیارە سەعات شەش و هەشت خولەکی لەسەرە. بەرەو خوار بوومەوە. لەسەری کۆڵانەکە کەمەکێك لام دابوو کە لەدواوە دەنگی ئۆتۆمبیلێکم بیست کە زۆر خێرا لە کۆڵانەکەوە دەرپەڕی و بەلای چەپی شەقامەکەدا دایشکانەوە، هێندە خێرا بوو کە حەزم کرد لەو خێرایییەدا توانایی خۆم بۆ وێنە گرتن تاقی بکەمەوە. هەر توانیم پێنج وێنەیەکی بگرم، کە بە ڕوونی دیارە سەعات شەش و نۆ خولەك و چل و چوار چرکە گیراوە، دوانیان تەواو کۆڵانەکەش دیارە کە پێچی لێ دەکاتەوە. بە مانای کاتی نێوان وێنەی کچەکە کە بەدڵخۆشی و هەڵمی نانە گەرمەکەیەوە لەگەڵ وێنەی سەیارەکەدا کە جوان دیارە لە کۆڵانەکەوە هاتە سەر شەقامەکە تەنها یەك خولەك و



چل و چوار چرکەیە، ئەوەش باوکی کچە کە لەتەنیشتمەوە دانیشتووە و لەوە دڵنیای کردیتەوە کە ڕەنگی ئەم سەیارەیە هەمان ڕەنگی سەیارەکەیە کە ئەو لەدوورەوە بینیبووی. بەڵگە لەمە زیاتر دەبێ چی بێت بەڕێزم.

(١٣)

نا، دکتۆر گیان، هەست دەکەم چاکبوونەوەی من هەمووی لە هەفتەی پێشووەوە دەستی پێ کرد کە دوو شتی گرنگی تیا روویدا. یەکەمیان کە بەڕێوەبەری پۆلیس بە دەنگە ناخۆش و گرەکەیەوە، بە لەرەیەکی پڕ سووپاسەوە پێی راگەیاندم کە پیاوەکەیان گرتووەو دانی بە تاوانەکەیدا ناوەو پێی سەیر بوو یەکێك لەو کاتەدا چەند وێنەیەکی جوانی گرتووەو بەخۆی نەزانیوە. وتی: باش بوو شوکور کچەکە نەمردووە دەنا نەمدەهێشت جارێکی تر رووناکی ببینێت چونکە بۆی دەرچووەو نەوەستاوە لەسەری. دکتۆر گیان! دووەمیشیان هەمان رۆژ کردنەوەی پێشانگاکەم بوو کە ماوەی چوار رۆژی خایاند و خەڵکێکی زۆر هاتبوون، کە دەچوونە دەرەوە دەست خۆشییان لێدەکردم و زۆربەی زۆریان دەیانووت: ماڵت ئاوا بێ، دەڵێی باسی ئێمە دەکەی، هەموو خۆمانی تیا دەبینینیەوە. سوپاس دکتۆر گیان! کە چاکت کردمەوە، سوپاس کە منت خستە سەر خولیا وێنەگرتنێکی جوانی ئەم دونیا ناشرینە.



ستۆکهۆڵم، ئۆکتۆبەری ٢٠١٢







تا پاریش، پاییز هەر
لەو دیوی دەروازەی
حەوشەوە
لە کۆڵان، قژ و پرچ،
خۆڵاویی
لەگەڵ «با» ئەوەستا و
هەندێجار
دوای باران
لە درزی باریکی
پەردەکەی تەمەوە
تەماشای ماڵەکەی
ئەکردم!

تا پاریش، پاییز هەر
لە ڕێگەی تریفەی تەزیوی
مانگەوە
دووراو دوور هەر بە سەر
سڵاوی ئەنارد و
زۆرجاریش لە پووش و پەڵاشی
وەرس و بێزاری
دەشتی بۆ... ئەناردم.



شەوانیش درەنگان
خەیاڵم ئەترسا و
لە باوەش خەزانیا ئەنووستم!

یەکەمجار... من دایکم
لە سیلەی ڕۆژێکی بەدبەختی
وەك خۆیدا
پاییزی نیشاندام
ئەوساکە تەمەنم لە خونچەی
گوڵەباخ کەمتر بوو!
پێی وتم:
پاییزیش وەك منە و بێوەژن
تەنیایە و دڵشکاو
حەز ئەکەم ئەویشت هێندەی من
خۆشبوێ و
چون نان و
چون نوقڵ و
چون سوخمە زەردەکەم
بیخەیتە سەر چاوان.
پێی وتم:
پاییزیش وەك باوکت شاعیرە و
بەڵام ئەم شیعری خۆی
هەمیشە هەر لەسەر



گەواڵەی کۆچەر و
تەوێڵی گردۆڵکەی ڕووتەن و
گەردن و سەرسنگی
درەختی ڕووت قووت ئەنوسێ!.
پێی وتم:
هەناسەی غەریبی
لە ڕەنگی پاییزدا
نیشانەی عەشقێکە سرمدی و
خەمێکە تا ئەبەد
ئەلەرزێ و ئەسووتێ!.
پێی وتم:
بۆ ئەوەی تەماشات
تێکەڵی تەماشای خوا بکەی
بچیتە نهێنی بوونەوە و
لە کۆچ و لە عەشق و
لە سەراب
تێبگەی:
هەر ئەبێ لای پاییز بخوێنی و
ڕەنگی خۆت
بە ڕەنگی حەسرەتی
ڕەنگبکەی!








تا پاریش پاییز هەر
لەو دیوی دەروازەی حەوشەوە
چون پرسیار ئەوەستاو
ناو بە ناو
شیعرمان بۆ یەکتر ئەنارد و
جار بە جار شەوانە
وشەمان ئەتەزی و ئەیبەست و
ڕۆژانەیش لە بەردەم
هەتاوی لاواز و نەخۆشدا
پەیکەری مەراق و ڕامان بووین
چاوەڕوان پێکەوە
بەرامبەر بە نادیار
ئەوق ئەبووین، دائەماین.

وا ئەمساڵ
چون باخی ئاوارە.. بێ پرس و
بێ ئەوەی کە پێشتر
زەنگێکم بۆ لێدا و پێمبڵێ
هاتۆتەماڵەوە و لەگەڵ خۆی
وەك دیاریی
باوەشێ لە شیعری زەردەڵەی
هێناوە

بۆ شەوی تەنیایی ژوورەکەم!.
وا ئەمساڵ
هاتۆتە لامەوە و
بە پڕمەی گریانی درشتی ڕێژنەی
قەڵەم و دەفتەر و
ئەلبووم و خەیاڵ و
خەمانم تەڕئەکا و
هەروەهایش پێخەف و چرپاکەم!.

تا پاریش پاییز هەر
لەو دیوی حەساری لەشمەوە
وەستابوو
ڕێی نەبوو
کە بێتە ناو ژووری لەشمەوە
دەسکاری دەروون و پەنجەرەی
هەست و نەست بکات و
ڕێی نەبوو
ناوەوەم داگیرکاو
هەست بکەم ڕەنگێکی کۆیلەم.
هەست بکەم من ئیتر خۆم نیم و
تەواوی تەمەن و جەستەمی
وەك (مانگ) ی



ناو گۆمی حەپەساو
تەسلیم کەم

بەڵام وا لەمساڵدا
هاتۆتە ماڵمەوە و هاتۆتە
دڵمەوە و
چیبوێ ئەیکات و کونج بە
کونج
بە کوچە و شەقامی ناو لەشما
ئەگەڕێ و
وەك باخان پژوپۆم ئەرنێ و
نایشتوانم چون خەزان
لەگەڵیا هەڵنەکەم!
ئەوەتا وا پاییز
هاتۆتە چاومەوە و لەگەڵیا
چڵ بە چڵ
تاڵ بە تاڵ
مووی سەر و تەماشام
ئەوەرێ.
ئەوەتا وا پاییز
هاتۆتە ناو سیما و ناو لۆچی ڕوخسارم و
سەر شان و سەر ملم و





کێومالم ئەکات و
لە کوێدا تۆزقاڵێ لە بەهار جێمابێ
بۆ ئەوەی زەردیکات
بە ناویا ئەگەڕێ.
وا پاییز هاتۆتە سەر پشتم و
کەپری خۆی ئەبەستێ.
هاتۆتە ئێسکمەوە و
مووڕەغەم ئەسوێنێ و
بڕبڕەم خەریکە
وەك لقی دارێکی ئێوارەی وشك ئەبێ و
ئەنەوێ.
وا پاییز ماسولکەم شل ئەکا و
کردوێتی بە پەڕۆ و
ڕۆیشتنم چون گەڵای ڕژاوی
بەر بای سارد
خشەی دێ و
چاویشی بە وردی
دەزوولەی قرچۆکی
هەنگاوی بوولێلم ئەژمێری.

من و ئەو
پاییزی ناو پاییز
ئێستاکە هەردووکمان

نیشتەجێی ماڵێکین
هۆدەمان یەك هۆدەی خەزان و
چرپامان یەك چرپای
هەناسە ڕێزان و
شیعرمان یەك شیعری
کۆچ ڕەوی ناو زەردەی ئێواران.

من و ئەو.. پاییزی ناو پاییز
وەلێ ئاخ.. من ئەبێ ماڵەکەی
بۆ چۆڵکەم
من ئەڕۆم.. ئەو ناڕوا و
دواجاریش ئەو لەسەر چرپاکەم
ئەخەوێ
وەلێ ئاخ... ئاخ و ئاخ
من
ئەمرم.
ئەو
نامرێ!

سلێمانی
پاییزی ٢٠١٢



# پاسکیله سوورەکە

هیوا قادر
نۆڤەمبەر ٢٠١٢

کچەکەم:
باوکت بە پاسکیلێکی سوورەوە لەسەر هەوری سپی ئاسمانە شینەکانەوە سەربەرەوخوار، بەخۆی و دوو قەلەرەشکەی سەر شانی و حاجی لەقلەقەکەی سەر سەری و پوشکە بەقنەکانی سەر عەینەکەکەی و پانتۆڵە هەنگ لەسەر نیشتووەکەی و کراسە خاڵخاڵۆکەکەیەوە، بەبێ ئیستۆپ قاچ لە هەورەکان ئەئاڵێنێت و وەك نیوە مانگێکی شکاو تۆزێك لەدوای خۆی هەڵئەستێنێت و لەبەردەم تۆدا ئەوەستێت.
وەك پەپوولەیەکی زەبەلاحی هەزاران ساڵ خەوتووی گەورە کە باڵەکانی لەگەڵ زەمەندا هەڵوەریبن، ئاوا باوکت تۆز لە خۆی ئەتەکێنێت؛ تۆ چاوە ڕەش و کوردانەکەت هەڵئەگلۆفیت، چاو ئەکەیتەوە، لەباوەشی باوکتا، وەك دانیشتن لەسەر قەڵاندۆشکانێی دێوێك، ئاوا دەریا لە خوار ئەژنۆی باوکتەوە ئەبینیت، تۆش سەرت لەگەڵ هەر هەنگاوێکدا گا لەسەر هەورەکانە و گا لە ژێریانا، گوێت لەتەپەی باڵ و قورگی قاز و قوڵنگەکان ئەبێت؛ کە لە خۆشیا سەر ڕائەوەشێنیت بەفر بەسەر شانی باوکتا ئەبارێت، کە قژی ڕائەکێشیت و لە قریوەیەکدا ئەڵێیت: بابە، وەك لە بێدەنگی ئەشکەوتێکدا گوێت لە دوو دڵۆپە ئاوی یەك لە دوای یەك بێت، دوو فرمێسکی تەقیو بەسەر گۆنای باوکتەوە ئەبینیت. وای کچەکەم:

هەرچ کاتێك سەیری ئاسمانت کرد
پێش خودا باوکت لە بیربێت،
نا لەبەر ئەوەی گەورەیە
بۆئەوەی لەسەر ئەو هەورانە بێتە خوارەوە،
دەنا هیچ باوکێك بەبێ بوونی ماڵێك باوك نییە.
لەبەردەمی دەرگایەکدا دۆشەکەڵەیەکی پینەکراوی پیرێژنێك کە هێشتا گەرمە بە قەرز وەرئەگرین
و لەسەری دائەنیشین، وەك فەرشی با پێی ئەفرین، تۆ توند قۆڵی ڕاستم ئەگوشیت،
بەسوکی بە گوێما ئەچرپێنیت: بابە؛ نوقڵی ترش و شیرین، ڕەحەتەلقوم، پسکیتی زەرد،
مەساسە، شەربەتی هەنار ئەخۆم. ئەو هەمووە! بەسەر چاو کچەکەم. تۆ وا ئەزانیت
هەموو ئەو شتانە لەسەر چاوی باوکتن، دەست ئەخەیتە سەر چاوم، سەر پێڵوەکانم
ئەگەرێیت؛ هیچی لێ نییە بابە! پێئەکەنم. سەیری چاوم کە؛ پێکەوە دیسان
سواری پاسکیلە سوورەکە بووینەتەوە، تۆ لە دواوە دەستە بچووکەکانت
بەسەر ئەو کەروێشکە سپیەدا ئەهێنیت کە لەگەڵماندا ڕائەکات، ئەڵێم
«سێوە» خۆت توند بگرە بانەکەویت! هێندە نابات بە ئاسمانەوە چاو
ئەکەیتەوە، دەستەکانت بەدەست دوو فریشتەوەن و لەگەڵیاندا
بەسەر مندا ئەفریت، ئەقریوێنیت، من لە خۆشی پیکەنینەکەی
تۆ، بەسەر پشتی کیسەڵێکی نوستووی سەر ڕێگاکەدا ئەڕۆم
و لەپاسکیلەکە ئەکەومە خوارەوە و ئەخزێمە ناو جۆگەلەیەکی
گۆرانیبێژەوە، کە هەڵئەستمە سەر پێ سەرتاپای گیانم شین بووە و
تەڕتەڕ بووم، شڵەژاوانە چاوئەگێڕم، گسکێکی شکاو لەویادا ئەبینم و سواری
ئەبم، تۆ ئەڵێیت بابە منیش دێمە لای تۆ، فریشتەکان لە دوای منەوە دەستێك
ئەیەن لە پشتت، دوو باڵی مێشێك لە پشتت ئەڕوێت، گیزە گیز ئەمشانە و
ئەمشانم ئەکەیت، پێش من ئەکەویت و گازێکی بچووك لە هەرمێیەك ئەگریت و
دەنکە گێلاسێك ئەگریتە لوتم و بەهێیەکی توکن ئەخەیتە گیرفانم و قۆخێك لە
ناوەڕاستدا لەت ئەکەیت بۆ هەردووکمان؛ وای بابە کەخۆشە، من ئەفڕم:
کچم چاوت لێیە فڕین
بیرت ئەباتەوە،
ئێمە بۆیە قاچمان هەیە تا لەسەر زەوی پێی بڕۆین،
کچم چاوت لێیە فڕین
چ موسیبەتێکی گەورەی شاعیرانە،






چاوت لێیە شاعیرەکان چەندە بریندارن.
کچەکەم؛ لەگەڵ مندا پێ لەسەر توێی ئەم ئاوانە وەك پێ لەسەر چێمەنی تەر دانێ و مەترسە؛ چاوت لەم هەموو وشە فڕێدراو و پیتە شکاو و ڕەنگ پواوانەیە، گوێت لەم هەموو دەنگە نوساو و خۆش و لەیەك ترازاوانەیە، ئەم هەموو تەنافە هەڵخراوانە کە پیت و نیوە ڕستەی تەڕی پیا هەڵواسراوە ئەبینیت، ئەم هەموو هەستە کە وەك هەناسە هەڵیان ئەمژیت و نایانبینیت و سنگت گەرم ئەکەن پێ ئەزانیت، ئەم هەموو دەمە کراوانە ئەبینیت کەدەست بەسەر دیوارەکاندا ئەخشێنیت و گۆناکەن و ناتوانن هیچ بڵێن؛ ئێرە: ئا ئەم کەلاوە نەبینراو و فەرامۆشکراوە، ناو مەملەکەتی ئەم هەموو وشە نەوتراو و ڕستە تەواونەبوانە ئەبینیت، ئەو قەرەوێڵەیە ئەبینیت کە بە پیتە بچووك و گەورەکانی «ئا» دروستمکردوون، جێگەی منە؛ ئەو لەمپا بەلادا کەوتووەی پیتی میم، کە پیتی نونی لێوە نزیك ئەکەمەوە دائەگرسێت، دۆلکەی ئاوەکەم کە مانگ هەمیشە وەك پارچەیەك سەهۆڵی نەمر لەناویایەتی، ئاوێنەکەی ژوور سەرم کە هێندە قوڵە هەندێك جار لێی ئەترسم کەسەر ئەکێشمە ناوی، کورسییە دارینەکەم بەدەم لەنگینیەوە دەنگی ئەو بولبولانەی لێوەدێت کە ڕۆژانێك بەسەریەوە نیشتونەتەوە، ئەم کەلاوەیە ئەبینیت کە ئەتوانیت بە گسکێکی دارخورما لەبەیانییەوە تا ئێوارە پڕ بە عەرەبانەیەکی سەد ئەسپی خوداوەندەکان جوانی لێ کۆبکەیتەوە، من ئا لێرە، ئا لێرە ئەژیم کچەکەم؛ باوکت لەم تەنهاییەدا وەستایەکی دەستەپاچەی ناو ئەم هەموو پیت و ڕستانەیە. کچەکەم ئەو کاتانەی بیرت کردم بەرگی کتێبێك بکەرەوە و وەرە بۆ لام، ئەو کاتانەی تورەبوویت لێم، کتێبێك فڕێدە دەریاوە، بیسوتێنە، فەرامۆشیکە لەناو تەپوتۆزدا.
هەرچ کاتێك سەیری ئاسمانت کرد
پێش خودا باوکت لە بیربێت
نا لەبەر ئەوەی گەورەیە،
بۆئەوەی لەسەر ئەو هەورانە بێتە خوارەوە،
پێی بڵێ ئەی گوناهبار، ئەی ئاگر دز، ئەی سیزیف، ئەی شاعیر؛
تۆ لە کوێیت!





# هێوربەرەوە ئەی ڕۆح

## ئیسماعیل حەمە ئەمین

چیرۆکی فەرامۆشکردنی ڕۆح:

هێوربەرەوە ئەی ڕۆح ، چونکە تۆ بەتەنێ لەدایکبووی .

هێوربەرەوە ئەی دڵ، چونکە تۆ بەتەنێ بەنێو ژیاندا ڕێدەکەیت.

کە پیربوویت و درەختەکانی دەرەوەت بەزەردی بینی،

دەزانیت تۆ تەنیاترین مەخلوقی ئەم دنیایە بوویت.

هێور بەرەوە ئەی ڕۆح ، تۆ چێژ لەتەنیایی خۆت وەرگرە، چونکە تۆ بەتەنێ،

تەنها بەتەنێ لەدایکبوویت.
کە سەفەرم بۆ ئەرخەبیلەکانی ئەوبەری خۆم دەستپێکرد، زانیم من چەندەها ساڵی تەمەنی خۆم بەهەدەر لەگەڵ مێینەدا بەسەر بردووە.
دەزانم ڕۆحی خۆم خستۆتە قەفەسی قەرەباڵغی ئەوانیترەوە.
ئێستا ئەی ڕۆح، منی گێل، منی خەڵەفاو، منی خەوبینەر دەگەڕێمەوە بۆ تەنیایی خۆم،
منی گێل، تازە بەتازە سارتەرم بیردەکەوێتەوە: ئەوانیتر بەردێکن بوونی منی لەسەر دەشکێت.
هێور بەرەوە ئەی ڕۆح...
ئەوە هەڵەی منە چەندەها ساڵە فەرامۆشی کردی..
هێور بەرەوە ئەی ڕۆح.
چیرۆکی من ئەی ڕۆح ، چیرۆکێکی سادەیە، چیرۆکی ڕاکردنە لەخودی خۆم،
وەك پیاوێك لەتەنیایی خۆی ڕابکات،
وەك مانگێك سەدیمەکانی خۆی لێ ونبووبێت،
وەك درەختێك بەتەنێ لەنێو دارستانێکی قوڵدا جێهێڵرابێت.
پیاوێك نایەوێت لەوە تێبگات کە ئەم بۆ دنیای قەرەباڵغ نەخولقاوە، ئەم بۆ لەدایکبوون نەخولقاوە، ئەم بۆ ژیان نەخولقاوە.
بۆکەس نەخولقاوە ئەم دڵە، جگە بۆ خۆی، بۆ خودێك کە تائێستا بەدووی خۆیدا دەگەڕێت.
هێور بەرەوە ئەی ڕۆح؛ من چیتر ڕاناکەم لێت، من دەگەڕێمەوە بۆ لات، من بۆلای تۆ دەگەڕێمەوە.
- هێوربەرەوە هاوڕێم تۆ چەقی ئەم دنیایەت، هێور بەرەوە ئازیزم تۆ چەقی ئەم دنیایەت.
ئەمە قسەی هاوڕێ شاعیرەکەم بوو.. قسەی ئەو بوو کاتێك هەردووکمان لەنێو دارستانەکانی ئەشقدا بەدوڕاوی بۆ خۆمان دەگەڕاینەوە .




من دەمێکە لەسەمای خۆم ڕادەکەم ئەی ڕۆح،
من دەمێکە لە غوربەتی خۆم ڕادەکەم،
دەمێکە ئەوەم لەبیر چۆتەوە کە من سەماکەرێکی تەنیای ئەم دنیا جەنجاڵ و قەحبەیەم،
دەمویست ئەوە لەبیربکەم کە ڕۆح لەوێ، لەنێو تەنیایی خۆمدایە نەك لەنێو باوەشی مێیینەکاندا،
سۆز لە شوێنێکی ترە ئەی ڕۆح، جەستەش لە شوێنێکی تر .
سۆز لەوێیە لەنێو باوەشی تەنیاییمدا وەك پیاوێکی خەیاڵی، وەك پیاوێکی بەدی ڕۆژەکانی خۆی،
وەك گێلترین پیاو،

ناسکترین پیاو،
بەدناوترین پیاو.
هێوربەرەوە ئەی دڵ؛ من لێت پەستم، چونکە تۆ بوویت منت بەنێو باخچەکانی مێینەدا تێپەڕ کرد، منت لەنێو مێگەلدا بەجێهێشت. تۆ بوویت منت گەڕانەوە بۆ نێو قەرەباڵغی دنیای فانی.
من وەك هێلکە شەیتانۆکەیەکی سەر سەخت خومار بووم بەشێداریی تەنیایم، وەك ڕەبەنێکی ئەبەدی،
وەك نیازکێکی نێو سارایەکی پیر،
وەك مارێك چێژ لە ڕووتبونەوەی ژەهر ببینێت،
وەك ئادەمێك بەنێو بەهەشتەکانی خۆیدا تێپەڕێت.
تۆ بوویت ئەی دڵ داوات لێکردم بگەڕێمەوە بۆ نێو سەدیمە تاریکەکانی مێینە، بۆ بەندیخانەکانی کۆمەڵگە و شەڕە بێهودەکانی نێو ئەم دنیایە، بۆلای ئەشق و موحیبەت.
ئەوە من بووم ئەی دڵ ڕۆحی نالیم لە تەنهاییدا لەبیرکرد:
«بڕوانە بونی ئەوەڵت و چونی ئاخرەت
هاتی چ ڕوت و قوت و، هەڵاتی چ لوس و پوس؟»
لە مەنفاکانی دڵەوە هەڵاتمەوە بۆ لات ئەی ڕۆح،
لە مەنفاکانی دڵەوە پەناهەندەی ئەبەدی تۆم ئەی ڕۆح.
من لەنێو تەنیایی خۆمدا بووم ئەی دڵ، لەنێو مانگ و ڕۆژەکانی خۆمدا بووم، لەنێو سەدیمەکانی خۆمدا پێمەلەم بوو لەگەڵ دنیای خەیاڵ، بەسەر جێگای مێینەکاندا تێدەپەڕیم و بۆ بەیانی لەبیرم دەکردن، لەشەودا بەنێو پەردەکاندا دەهاتین و دەچووین و لەبەرەبەیانیشدا پێکەوە گوێمان بۆ باڵندە تەرەکانی ئەم دنیایە ڕادەگرت. بەڕووتی یاریمان بەجەستەی یەکتر دەکرد، یەکترمان بەنێو ڕاڕەوی کۆشکی خەیاڵی خەلیفە عەباسییە شەهوەتبازەکاندا ڕاودەنا و لەتەنیشت یەکەم چەرچەفەوە تێکەڵی یەکتری دەبووین.
ئەمە خەیاڵی من بوو ئەی ڕۆح؛ کە مێینە بەئالۆشەکانی موحیبەتم پێڕاودەکرد و



لەبەیانی دووهەمدا لەبیرم دەکردن. ئەوان خەونیان پێوە دەبیینیم ئازیز، ئەی دڵ.. وەك چۆن  پێرسیفۆنیا
لەدنیای «هادێس» خەونی بەئەدۆنیسەوە دەبینی، ئاوەها خەونیان پێوەدەبینیم، منیش فەرامۆشم دەکردن و
لەیەکەم پێچدا دەگەڕامەوە بۆ ڕۆح.
ئاوەها وەك ئەدۆنیسێك لە باخچەکانی ڤینۆسدا، لەنێو قەسیدەدا ژیانم بەسەر برد .
ئەوە تۆ بووی ئەی دڵ منت گرفتاری تاك مێینەیی کرد، مێینەیەك لە خەیاڵەوە هاتە نێو دنیای منەوە، لە
دەرگاکانی خەیاڵەوە منی هەڵخەڵەتاند.
چەند خۆشە لەنێو هەڵخەڵەتاندا بژی، چەندە سەختە وەئاگا بێیتەوە!
ئیدی گلەییم لێمەکە ئەی دڵ، ئاخر ئەی دڵ من لەجنسی خۆشباوەڕانم، لەجنسی وشەم،
لەجنسی خۆرم کە خۆی دەسوتێنێت بۆ جوانی، من لەجنسی بەدی شیعرم ئەی دڵ.
ئەی  دڵ ڕۆژەکان وەهابوون، وەها تێپەڕین، لەنێو خۆیاندا منیان وەك گێلترین فیگور دۆزیەوە،
کە ئامادەیە خەیاڵ لەبیربکات و خۆی هەڵداتە نێو قەرەباڵغی دنیاوە. وەك چۆن
«پۆسایدۆنی» خواوەندی دەریا لە پەرستگایەکدا لەگەڵ «میدۆزا»ی حۆری ڕۆژە
شەڕانیەکاندا خەوت. لەو کاتەوە میدۆزا پرچەکانی بوون بەهێلانەی مار، لەوکاتەوە
هەموو ئەو نێرانەی سەیری میدۆزایان بکردایە دەبوون بەبەرد و لەشوێنی خۆیان لە
بیردەکران.
ئاوەها ئەی دڵ من لەگەڵ میدۆزا ژیانم بەسەربرد، ڕۆحم بوو بە بەردێکی بەجێماو.
ئەی دڵ ئەوە تۆ بوویت  منت بردە سەر جێگەی میدۆزای عەیار، پێت گووتم: بەختەوری
لەوێیە، دنیای تۆ لەسەر جێگەکانی ئەو وەك پشکۆ دەگەشێتەوە، قەسیدە لەوێیە، ئارامی
ڕۆحت لەوێیە..
ئاخر من لە درۆ تێناگەم ئەی دڵ، من لە درۆکانی ئەم ڕۆژانە و ئەو ڕۆژانە تێناگەم، من هەرگیز مێیینە
و درۆم پێکەوە بەند نەکردبوو. من نەمدەزانی ڕەدوکەوتنی دڵ، ڕەدوکەتنی ژیانێکە لەنێو درۆیەکی
جواندا.
چیرۆکی درۆ، چیرۆکی مێینەیەك بوو لە ڕۆژێکی تەنیاییمدا، لە باخچەیەکی لەبیرکراودا هاتەبەردەمم و
پێیی گووتم : من مێینەی تۆم ئەی شاعیر، من بەردەوامی تۆم لە خەونبینیندا ئەی خەیاڵی، من فەرشێکی
میهرەبانی هەموو ڕۆژەکانی داهاتووی تۆم. پێم بەسەردا بنێ ئەی شاعیر، لە سەرم پاڵکەوە و دنیا
لەبیربکە.
من گەشانەوەی تۆ بەسوتانی خۆم دەپارێزم. بمهێنە بۆ نێو دنیای خۆت ئەی شاعیر، بمهێنە بۆ نێو ڕەنگە
نەبینراوەکانت، بۆ نێو گومانکردنت لە ئەقڵانیەت، لە مۆدێرنە، لە دنیای هەبوو، لە خەیاڵ و خەیاڵبۆکراو،
لە بینراو و نەبینراو، لە فانی و دنیایی. بمهێنە بۆ نێو باخچە نەبینراوەکانت ئەی شاعیر، بمهێنە بۆ نێو
ژیانی پڕ ئیدیا و ماڵێك کە گۆزەیەکی ڕەنگین لە دوو شوێندا بوونی هەیە، کە ڕۆحی نالی بەسەر



گەڵاکانەوە ئەلەنگێتەوە. بۆ ماڵێك کە سادەیە ، بمهێنە بۆ ماڵی خۆت، بۆ دنیایەك کە وەك هی ئەوانیتر نییە.
من و میدۆزا گەشتمان بەنێو دەریاکاندا دەستپێکرد، گەشتێك بەنێو کیشوەرەکانی هادێسی خوای مردن، بەنێو وڵاتانی بەفر و ئۆقیانوسی بەستەڵەك و تاریکایی لەپڕ داکەوتووی ڕۆژە لەبیرکراوەکانی خۆمان. من نەمدەزانی ئەی دڵ لەو دیوو شەپۆلی دەریاکانەوە شەڕانیەتی میدۆزا خۆی بۆ حەشار دابووم، لەودیوو خەوتنی سەرجێگەکانەوە شەڕانیەت وەك لاولاوێکی ڕەش لەنێو دەمارەکانمدا خۆی هەڵدەواسی.
ئەی ڕۆح من لەپێچەکانی دڵدا تۆم لەبیر کرد و تەنیایی خۆم خستە کۆشی میدۆزاوە، من لەگەڵ میدۆزادا خەوتم و بیرم چوو وەك «هێرکولس» ئاوێنەیەك لەگەڵ خۆمدا هەڵگرم، لەکاتی ئاهاتی سەر جێگا دەم و چاوی خۆی نیشاندام .. بۆ هیچ نا... تەنها بۆ ئەوەی ڕۆح لەبیر نەکەم، بۆ ئەوەی ڕۆح نەبێت بە بەردێکی بەجێماو.. من هەر لە سەرەتاوە ئاوا پاڵەوانێکی دۆڕاوی دنیای مێینە بووم.

من میدۆزام لە عەسرێکی داکەوتووی هاوینێکی سەرسەختەدا ناسی کەبۆنی خوێن بەهەڵوژەکانەوە شۆڕبووبوونەوە، من لەزەمەنی خوێندا میدۆزام ناسی، من لەزەمەنی خوێندا وەك ئەدۆنیسێك بیرم لەپەڕلە ڕەشەکانی مێینە نەدەکردەوە. بیرم لەهەموو ئەو خوێنە ڕژاوانە دەکردەوە کە بەئاسمانەوە لکابوون، بیرم لەسنوورەکان و لەو ڕووبارانە دەکردەوە کە لاشەی براکانمی بەسەرەوە بوو. لەو درەختانەی جێگەی گوللە و پەڵە خوێن و سپیاتی مۆخی پرژوایانی بەسەرەوە جێماوە، لە قەرەباڵغی ئەو خوێنڕژانانەدا ئەی ڕۆح بیرمچوو. کە ئەوە دڵ بوو ئادەمی لەبەهەشتەکانی خواوەندا بۆ هەتاهەتایی لەسەر ئەم زەویە قەحبەیە نەفی کرد، ئەم زەویەی کە ئادەمی توشی حەوایەك کرد بەدڵی میدۆزاوە بژی.
نەفرەت بێت لەم زەویە کەپڕێتی لەئەشق .
پڕێتی لە ڕق و پڕێتی لەدرۆ ..
ئاوەها من لە عەسرێکی داکەوتوودا میدۆزام ناسی، لەو باخچەیەدا کە ئادەم بەتەنهایی پێیدا تێپەڕ بوو، من لەو باخچەیەدا لەتاو خوێنی براکانم ئەوەم لەبیرکرد،



ئادەم لەو باخچەیەدا بەخودای گوتبوو: من تەنیاترین مەخلوقم و تۆ بەهەڵە لەپەراسووەکانی خۆم مێینەت خەڵقکرد.
قەحبەیە ئەم زەویە کە تەنها دنیا مێینەیە و هیچیتر..
قەحبەیە ئەم زەوەیە کە دنیای نێرینەیە و هیچیتر.
قەحبەیە ئەم زەویە کە ئەم دووانە لەتەنیایی خۆیاندا بەدەستی یەکتری دەکوژرێت.
من خەمێکی دیکەم هەبوو ئەی ڕۆح، خەمی پەرشبوونەوە بەسەر ڕووبەرەکانی ڕۆژهەڵاتدا، خەمی گەوزاندن لە خوێنی شەرە بێهودەکانی ئەوانیتردا، من چ گاڵتەجارێك بووم لەم دنیا بەرینەدا، من چ ئەکرۆباتێك بووم لەسەر پەتە باریکەکانی بێهودەیی، من ماسیەکی درندەی دەریایەکی ڕەش بووم، بەتەنێ بەنێو قەوزە ژەهراویەکاندا تێپەڕبووم و بۆنی خوێن خوماری کردبووم وخەونم بەخۆرێکەوە دەبینی کە تەنها هەر من ئەبینێ، بەگوڵێکەوە ئەبینی لەئاگری خۆرێکی لەبیرکراو دروستبووبوو، بەڕووەکێکی ژەهراوی سەر مانگەوە. من تەنیاترین ماسی ژەهراوی بووم لەنێو خەیاڵی پیاوێکدا کە تەنها قەسیدەی دەناسی و هیچی تر.




دنیا هەر وابووە ئەی ڕۆح، ئەی دڵی من، دنیا هەروا لینگی بۆ جەردە و بارزگان و گێل و داگیرکەر و بەرتیلخۆر و درۆزنەکان کردۆتەوە.. تەنها بۆ تۆ نەبێت ئەی شاعیر، ئەی خەڵەفاو، ئەی قەسیدە.
لەعەسرێکی ئاوەهادا کە وەك شاعرێك بیرم دەکردەوە و خەونم دەبینی، وەك شاعیرێك بیرم لەمەخلوق و خالیق دەکردەوە، میدۆزام لەنێو باخچەکانی ئادەمدا ناسی. ئەی ڕۆح ئەوە چرکە ساتی ماڵئاوایی من بوو لە تۆ. ئەوە چرکەساتی جێهێشتنی تۆ بوو لەسەر ئەرخبیلەکانی گولاکی دڵ.. لەوێوە دڵ زیندوو بۆوە ئەی ڕۆح، لەوێوە دڵ تۆی فەرامۆشکرد و تەنیایی خۆی بەخشی بە میدۆزا.

نورنبێرگ ئازاری ٢٠١٠
بەشێك لە قەسیدەیەکی درێژ

**کتێبی پەراوێزنووسان**
**هەوڵێك بۆ پۆلێنکردنی کتێبخوێن**
**کایەی کتێب: دەقی گێڕانەوە/ ڕامان**
**نووسینی: عەتا موحەمەد**
**بڵاوکردنهوە: ناوەندی ڕۆشنبیری و هونەری ئەندێشە**

له کۆندا پەراوێزنووس و راڤەکاری کتێب، ئەوانەی له کەنارو رووبەرە سپییەکانی کتێبدا دەیاننوسی، رۆڵێکی گرنگیان له خوڵقاندنی کتێبدا بینیوه و زۆرجار ناوبانگیان هیچی کەمتر نەبووە لەنووسەری ئەسڵیی کتێبەکە.

کتێبی پەراوێزنووسان، گەڕانە بەناو ئەو پەراوێزانەی خوێنەری ئەم سەردەمە له کتێبەکاندا بەجێیدەهێڵێت. گێڕانەوەی کۆمەڵێک حیکایەت و بەسەرهاتە، له ڕێگای شوێنپێ هەڵگرتنی ئەو خوێنەرانەوە، که بەمەبەستێک ئاماژەیەک یاخود نووسینێک له لاپەڕەی کتێبەکاندا بەجێدەهێڵن. ئەم کتێبە هەوڵی جۆرێک له پۆلێنکردنی خوێنەر دەدات، ئەویش لەڕێگای کۆکردنەوەی چەند کتێبێک، که خوێنەرانێکی نادیار پەراوێزیان تێدا بەجێهێشتووە.

ئەم کتێبە له ڕێگای گێڕانەوەوە، هەوڵدەدات باس لەو خەون و بەرژەوەندی و مۆراڵە بکات که خوێنەر لەبەردەم کتێبێکدا هەیەتی. بەو مانایەی هیچ خوێندنەوەیەک بێلایەن نییە.

کتێبی پەراوێزنووسان، له بەشی یەکەمیدا بەناوی «لەبارەی پەراوێزنووسانەوە»، گێڕەرەوە باس له پەراوێزنووسان و کتێب دەکات. دوای ئەوە ئەم بەشانە له خۆی دەگرێت: بەلزاک و بەرگدرووە چینییەکە، تامی وشە، بازنەی سیحری، کۆشکی خەونەکان، بەپێ تا ئەوپەڕی دنیا، نەفرەتی کوێرانە، خەونەکانی ئێنیشتاین، پیاوێک له تاریکیدا، خەونبینین بە پورتوگالی، دژ بە یادەوەری. هەر بەشێکیش لەمانە، حیکایەتێک لەڕێگای کتێبێکەوە دەگێڕێتەوە، که خوێنەرێک پەراوێزی تێدا بەجێهێشتووە. له دوا بەشیشدا بەناوی «منداڵێک نەخشەکان فریویاندا» گێڕەرەوە بەسەرهاتی خۆی لەگەڵ خوێندنەوەدا دەگێڕێتەوە.



# مانیفێستێکی تووڕە و گومانکارانە سەبارەت بە شۆڕش یان کەشتی فریشتەکان و سەردەمێکی شەیتانپەناهی

شێرزاد حەسەن

دەستپێك:

من دەزانم رەخنە لە بنەرەتدا خوێندنەوەیەکە کۆمەڵێك کەرەستەی گەرەکە تاوەکو ببێت بە کردەو چالاکییەکی باڵاتر بۆ خوێندنەوەی ئەم تێکستە وەك بەرهەمێکی داهێنەرانە، بۆیە ئەوەندەی حەزمە وەك گەشتی یەکێك لەسەر نشینەکانی «کەشتی فریشتەکان» بمبینن، نەك وەك رەخنەگرێکی پرۆفێشناڵ، رەنگە هۆیەکەی ئەوە بێت کە من عاشقانە و بە سۆز و هەڵچوونی خوێنەرێکەوە لەم تێکستە

نزیك دەبمەوە نەوەك وەك کەسێکی
ئاکادیمی کە سەروکاری لەگەڵ
پێوانەکانی ڕەخنەی ئەدەبییە، ئەمەی
من گفتوگۆیەکە بۆ پتر تێگەیشتنی
خۆم و شیکاری مانا شاراوەکانی ئەم
ڕۆمانە، گەڕانێکە وەك ڕۆمانەکە
بۆ دۆزینەوەی ئەودیوی ئەو واقیعە
مردووەی پێمانی دەفرۆشنەوە
وەك «شۆرش» بە درێژایی مێژوو،
پەڕینەوەیەکە لە ڕووکەشەوە بۆ
دیوە شاراوە و پەنهانەکەی، چونکە
هەموو ڕۆمانەکە هەوڵی دۆزینەوەی
ئەو واقیعە دەدات کە لە ڕەگەزە
پەرتبووەکانی فەزایەکی عەدەمیی
دروست بووە، عەدەمییەتی شۆرش،
پاساوی سەرەکی لەوەدا بۆ من ئەوەیە
کە من لەزەت لەو هەموو پرسیار و
گومانانە دەکەم کە لەسەر شۆرش
و خۆشەویستی و ئازادی و خیانەت و
هەرەس و ڕابوون و ڕاپەڕین و سێکس
و نیشتمانپەروەری  و خۆفرۆشی و بگرە
خودی ژیان و مەرگ و نهێنییەکانی
و دەیەها بابەت و تیمەی دیکە کە
پانتایی ئەم ڕۆمانەیان داگیر کردووە،

ئەوەیان جۆرێك بوو لە گیرۆدەبوونێکی چێژبەخش، ئەوەشیان لەوەوە
هاتووە کە من هەر هەموو گومان و پرسیارەکانم لە لا خۆشەویستن
و هاوسۆزیم لەگەڵ  دەقەکە لە سۆنگەی قایلبوونە
بەوەی کە یەکە شا ـ نیازی نووسەر سکانکردنی هەر
هەموو بەرخودان و هەڵگەڕانەوەو شۆرشی کوردانە
لە «سی و حەوت ساڵی» ڕابردوودا، بەڵکو زۆر لەو
ماوەیەش درێژتر کە مێژووی شۆرشی ئێمەیە،
هەر لە سەرەتای سەدەی بیستەمەوە کە
دروشمی ئازادی بەرز کردۆتەوە و بانگەشەی
ڕزگارکردنی خاك و خەڵکی کردووە،  بەڵام
ئەو زەمەنە کە زەمەنی ڕووداوەکانە بەتەنها ئەوە
ناگەیێنێت کە شیکاری شۆرش لەو زەمەنەدا گیری
خواردووە،  بەڵکو وەك کشانی کات بۆ سەردەمێکی
دوورتر لە ڕابردوودا بەکێشمان دەکات، لەوەش واوەتر
کشانی زەمەنێکی ترسناکترە کە لە ئایندەیەکی نزیك و
دوورتر چاوەڕێمانە، بەو بەڵگەیەی کە شۆرش پەیوەندییەکی
ئۆرگانیکی بووە لەگەڵ  ڕۆحی شەڕانگێزی کە سەرلەبەری
ژیانی ڕامیاری و کۆمەڵایەتی  ئێمەی داگیر کردووە، گەرچی
ئەوەیان وەك شۆرش لە «هەنووکەدا و لێرە»دا تاکە سەروەری
و چالاکییەکە کە حزبەکان و خودی خودانەکانی کایەی سیاسی
ئێمە شانازی پێوە دەکەن، گومانکردنەکە پتر بەرهەمی ئەو
بیست و دوو ساڵە نییە کە لە نزیکەوە پاڵەوانانی شۆرشەکانمان
بینی، بەتایبەتی لە دوای ڕاپەڕینەوە ئەو ڕۆحە کلۆڵەی زۆربەیان
ئاشکرا بوو کە لە ناوئاخندا نوقمی توندو تیژی بووە کە



ڕەگوریشەکەی دەگەڕێتەوە بۆ قۆناغی شاخ کە لە تەواوی ڕووداوەکان و کارەساتەکاندا خۆیان دەنوێنن و دواتر ئەو شەڕانگێزییە دەبێت بە مۆرك و خەسڵەتی سەرەکی زۆربەی ئەکتەرەکانی سەر ئەو شانۆی شۆڕش و سیاسەتە، جێنەخشی خۆی لەسەر ڕۆحەکان بەجێدێڵێت، ڕۆحگەلێك کە ئەوەندەی بۆنی خوێن ئەوانی لێخوڕیوە، ئەوەندە بەها بەرزەکانی شۆڕش ڕایانی نەداوە. خودی ئەو گومانە لە خودانی شۆڕش و ئاغاکانی سیاسەت هەر هەبووە ، وەلێ بە پیرۆزکردنی کارەکتەر و گەمەکەرانی ناو شۆڕش نەیهێشتووە کەس بە ئاشکرا، چ بە زار و چ بە نووسین، گومان لە ڕەوشتی هەڵگرانی ئەو ئاڵایە بکات، گەرچی ئەمڕۆکە ڕۆحی نابەڵەد و دزێوی زۆربەیان بۆ دۆست و دوژمن ئاشکرایە.

ئەدەبی بەرگری ئێمە بە درێژایی سەدەی بیستەمین دڵنیاییەکی زۆری بەخشیوە بەوەی کە دوو بەرەی دوژمن بە یەکدی لە جەنگدا بوون، ئێمەی لەسەر هەق و ئەوانی دیکەی ناهەق ، دوو جەمسەری داگیرکەر و داگیرکراو، ئەو جیاکردنەوەی دوو جوگرافیایە لە یەکدی نەیهێشتووە لە خۆمان ڕابمێنین، لەوەی گوتاری زاڵی رزگاری نەتەوەگەری بوواری نەداوە گومان لە هیچ جوڵەو کار و سەردەمێکی خۆمان بکەین، رۆمانی «کەشتی فریشتەکان» لە پێچێکی زۆر ڕکدا بە تەواوی ڕوو لەو نەغمە تازەیە دەکات کە گۆمانێکی گەورە لەگەڵ خۆیدا دێنێت و بۆ یەکجاری ماڵئاوایی لەو یەقینە شۆڕشگێڕییە دەکات کە هەمانبوو، هەر هەموو پاڵەوانەکانیش وەك کارەکتەری ناو شانۆگەرییە یۆنانییەکان کە لەلایەن خوداوەندەکانەوە جوڵە و قسە و ڕۆڵیان ڕەنگرێژ کرا بێت، شۆڕش بە هەمان هێزی زۆر زاڵ و خواهانەی خۆی ئەکتەرەکانی سەر شانۆی خۆی ئاراستە دەکات و لێیاندەخوڕێت، بەڵام ڕووەو جەهەننەم، نەك بەهەشتی بەڵێن پێدراو.

هەر لە لاپەڕەی یەکەمەوە تێدەگەین ئەوانەی سەرقافڵەچی ئەو شۆڕشە بوون وەك یاساوڵ و پاسەوانی زیندانەکان دەردەکەون کە بۆ یەکدی دیلکردن دروستیان کردووە، نەك بە تەنها بۆ دوژمنانی داگیرکەر، ژمارەیەکی زۆر لەوانەی کە جەنگاوەری نەخۆش و شەرانگێزن پتر کینە و رق و گومانی گەورە و ترس پێکەوە کۆی کردوونەتەوە، نەك دروشمە ڕەنگاو ڕەنگەکانی شۆڕش، کە بە خوێن دەست پێدەکات و هەر بە خوێن کۆتایی دێت، دانسقەیی ئەم رۆمانەی «بەختیار عەلی» لەوەدایە کە قسە لەگەڵ هەموومان دەکات و لەسەر هەمان خوانی سیاسەت و شۆڕش

کۆماندەکاتەوە، کێشەکەش لەوەدایە هێدمەگرتی دەبین و شۆکی ئەوە داماندەگرێت کە ئێمە ناچار دەکات گومان لە تاکە شا ـ چالاکی خۆمان بکەین کە سەدەیەکە رووباری خوێنی بۆ دەڕێژین، کە پڕە لە سەرکەوتن و هەرەس و شکست، بەڵام سەرکەوتنە کەمەکانیش بە بەراورد لەتەك دۆڕان و نشوستی و بە شەیتانبوونی ئێمە مایەی تێڕامانە، ئێمەیەك کە لە ئاکامدا وەکو مرۆڤ دەدۆڕێین و بگرە سەرکەوتنەکان بێجگە لە درۆ و وەهم هیچی دیکە نەبوون، کێشەی سەرەکی ئەم تێکستە لەوەدا دەبێت کە ژمارەیەکی زۆر بێت یان کەم حەزی لەوەیە لەناو درۆ و وەهمی ئەو شۆرشەدا بژی و بلەوەڕێت و بخەوێت و هەرگیز بێدار نەبێتەوە، کە من مەزەندەم وایە ژمارەیەکی قەبە لەزەت لەو درۆ و خۆهەڵخەڵەتاندنە ببینن، یان هەر بە راستی خاوەنی ئەو هوشیارییە نەبن کە دادگایی شۆرش و کردەی سیاسەت بکەن، لە هەمووانیش بێ هۆش و گۆشتر ئەوانەن کە ئاشی شۆرشەکە دەگەڕێنن، چونکە خوێنەرەکان بە گوێرەی پێگەی خۆیان و پێشینەی فیکرییان دادگایی ماجەرای ناو ئەم دەقە دەکەن، بەڵام ئاغایانی سوودمەند لەو شۆرش و بازاڕی گەرمی خوێنە نابنە خاوەنی ئەو ئەخلاقە کە دادگایی خۆیان بکەن. دیارە کە کەس نادۆزینەوە لە ئەکتەرەکانی شۆرش ئاسوودە بێت بە خوێندنەوەی گەورەترین گومانکردن لە یەکێك لە پیرۆزترین شۆرشەکانی ئەم سەدەیەی ئێمە کە ئەوەندە سەر بە رابردوویەکی دوور نییە، شۆرشێك کە تا هەنووکەش لەناو تەپو تۆزەکانیدا خۆمان دادەتەکێنین، گەرچی دەکرێت ژمارەیەك لە خوێنەرمان دەست بکەوێت کە بە رۆح ئامادەیە بگۆڕێت لە میانەی گەشتی خۆی لەگەڵ ئەم رۆمانەدا، هەنگاو بە هەنگاو، هەر وەك شا ـ کەسی ئەم رۆمانە ، وەفای رەفعەت بەگ ـ ی داستانبێژ و شاسیخوڕێك کە رۆحی خۆی بە شۆرش دەفرۆشێت، کەچی لە بڕوا و یەقینێکی کوێرانەوە بە حزب و سەرکردەکانی دەپەڕێتەوە بۆ گومانێکی گەورە دوای ئەوەی تێدەگات کە شۆرش بێجگە لە دزێکی تەڕدەست و ناقۆڵا هیچی دیکە نەبوو، کە توانی ژیانی ئەم و سەدەهای دیکە بە تاڵان ببات، ئەم گومان و گۆڕانە تەنها ئەو وەختە فەراهەم دەبێت کە وەکو «وەفا» کە دواتر دەبێت بە «لیوا جەنگیز»، ئێمەش ئامادە بین وەکو ئەم ئەو فریشتەیە ببینین کە نیشتەجێی رۆحمانە و بەڵام لەوە پتر ناتوانێت لەناو قەفەزی ئەو شەیتانەدا بژی کە خۆمانین، بەو مەرجەی واز لە بیر و بڕواکانی پێشین بێنین کە لەسەر پیرۆزییەکانی شۆرش دروستمان کردوون، یان لە بنەرەتدا وەك رۆماننووسەکە خاوەنی



ئەو هوشیارییە زۆر زاڵ و پڕە بین کە قایلمان بکات بەو بڕە زۆرەی گومان لە بەرامبەر شۆرش و تێکۆشان. ئەوەشیان تەڵاقێکە بێ ئازار و خەم کۆتایی نایەت، کە پتر لە مەمك کردنەوە و لە شیر تۆرانی منداڵان دەچێت ئەو وەختەی ناچار دەکرێن لە کۆش و باوەشی دایکانیان بێنە دەرێ.

ئەم تێکستە گەورەترین( مانیفێستی) گومانکار و تووڕەی «بەختیار عەلی» یە لەمەڕ شۆڕش و تێکۆشان، ئاسان تێناپەڕێت، دیسانەوە دۆست و دوژمنێکی کەم و زۆر لە دەوری کۆ دەبنەوە، چونکە ئەدەبی ئێمە بە درێژایی سەدەی بیستەم، بە تایبەتیش لە نیو سەدەی رابردوودا کە هاتۆتە پای ئاوڕدانەوە لە شۆڕش و بەرخودان، پتر دیوێکی ئاهەنگسازی و پێشوازی و هاندان و پیرۆزکردنی بەخۆیەوە بینیووە، بەتایبەتی شیعر کە هەمیشە بەو رۆحە لیرکییەی کە یار و دڵخوازی دواندووە، هەر بە

هەمان جۆشوخرۆشەوە شۆڕش و رەمزەکانی دواندووە، یان دڵگەرمانە و دەروێش ئاسا ئاگری خواردووە تاوەکو شێخەکانی سەرسام بکات، بۆ هەمیشەش تینوێتی بە گڕ شکاوە. «ئەدەبی بەرگری» ی ئێمە کە خوانی پڕ و پیرۆزی ژمارەیەکی بەرچاوی نووسەرانی شاخ و شار بووە، ئەوەندە بەو رۆحە نەتەوەگەرییە گۆش کرا بوو کە بواری کەمترین گومانی نەبووە، ئەو رۆحە بریندار و نەرسیسییەی نووسەرانی ئێمە لە بازنەی شیعر و ئەدەبی داستانیشدا هەڵگری کەمترین گومان و دڵەراوکێ بووە، ئاوێتەبوون لەگەڵ شۆڕشدا وایکردووە کە قەڵەمی نووسەران وەك تفەنگەکانی پێشمەرگەکان چاویان لێبکرێت، هەر ئەو رۆحە لیرکییە و سترانئامێزە، سەرباری گوتاری زاڵی پڕ لە جۆش و خرۆشی مانەوە و نەتەوەپەرستی، بە جۆرێك بووە کە دەکرێت ناو بنرێت « کوێربوونی شاعیرانە»، وەها کوشندە بووە بۆ سەردەمی ستەمکاری ناو شۆڕش کە رێگای نەداوە دیوە ناشیرینەکەی ببیندرێت، گەر یەك ـ دوو تێکست گومانێکیان خستبێتەوە، سەنگ و حیسابێکی قورسی بۆ نەکراوە و هەتیو کەوتوون، بێجگە لەوەی کە خاوەنی ئەو چەند تێکستە هەتیوکەوتووە وەك پەشیمانبوونەوەیەکی بەپەلە یان خۆسزادان هەر زوو بە زوو بوونەتەوە بە ئەندامی ئەو کۆرسەی بۆ شۆڕش دەیانچریکاند یان یەکێك لەو کۆمبارسە نادیدەی سەر شانۆکە، بە تایبەتی دوای ڕاپەڕین، بەتەنها کەم گومانێك بووە لە دۆخێك و کارەکتەرێك، نەك ئەو گومانە گەورەیەی کە هەموو رۆحی بزاف و ئەکتەرە سەرەکییەکانی بگرێتەوە، هەر هەموو دیمەنە گشتییەکە ببینێت، بە شێوە و رەسمی

بازنەیەك كە گەمارۆی هەموو رووداوەكان و كارەكتەرەكانی دابێت، بە هەر هەموو رەهەندەكانیەوە: ئاسۆیی و شاقولی و قووڵایی، بە جۆریكە كە هیچ گۆشەیەك نەبوێرێت و هەموو فەزاكە داگیر بكات كە ئەوەیان وا دەكات چاوی رۆماننووس بە چاوی «چۆلەكە پاساری» بچێت كە هەر چواردەوری خۆی دەبینێت.




ئەم رۆمانە نۆبەرەی ئەو گومانە گەورەیە دەبێت لەمەڕ شۆرش، گومانی ئەوەش لە ئارادایە كە سیاسەتبازەكان بەدەستی ئەنقەست بیكەن بە هەرا و خۆ تووڕە بنوێنن لەوەی كە هەق نییە نووسەران ئەو نووزە كزەی گومان و دڵكرمێ بوونە بەسەر ئۆركێستراى شۆرشدا زاڵ بكەن، لە كۆنیشدا هەر وایانكردووە، بەڵام هەر زوو بە زوو باوكانی شۆرش ویستوویانە گەمەكە ببەنەوە و وانەیەكی رەوشتئامێز بە هەمووان بڵێنەوە و نووسەرەكان ببەخشن و بیانگێڕنەوە دیوەخانەكانیان. سەرباری ئەوەی ئەدەبی كوردی بە درێژایی سەدەی بیستەم، بەتایبەتی ئەدەبی داستانئامێزەكەی سێ پاڵەوانی نەبەزیوی هەبووە: كرێكارێكی جەنگاوەر دژ بە قەڵای بۆرژواكان و سەرمایەداران، دووەمیان جووتیارێكی كۆڵنەدەر دژ بە ئاغاكان و دەرەبەگەكان، سێیەمیان پێشمەرگەیەكی سوپەرمان كە هەرچی خەسڵەتی مرۆڤبوون هەیە لەو مرۆڤە سەندراوەتەوە و ئەركە پیرۆزەكەی ئەوە بووە مەرگی خۆی هەرزانفرۆش بكات، خودی وشەی پێشمەرگە واتا پێشڕەویكردنی مەرگ خۆی و ئامادەباشی تەواو بۆ نەمان، دروشمی « كوردستان یان نەمان» بۆ خۆی ئامادەگییەكی ڕەمەكی هەبووە بۆ مەرگ، چونكە مانەوە و ژیان دوو دۆخی تەواو جیاوازن، بە تەنها مانەوەمان لە كوردستان دۆخێكی مانەوەیە وەك هەموو گیاندارەكانی دیكە نەك وەك خودانی ژیانێكی ئادەمییانە، ئەم نەغمەی «نەمان» ە هێمایەكی مەرگدۆستی تێدایە، هەر نووسەرێك چیرۆكەكانی پڕ نەبووبن لەو سێ جۆر پاڵەوانە «جوتیار، كرێكار و پێشمەرگەیەكی سوپەرمان» بە خیانەتكار تەماشا كراوە. ئەدەبی بەرگری، وێڕای ئەوەی كە دەرئەنجامی ململانێی درێژخایەن لەگەڵ دوژمناندا وایكردووە نووسەران بە رۆحێكی ئاهەنگسازییەوە شیعر و شانامە و چیرۆك بۆ شۆرش بنووسن، بواری گومان و دەرخستنی ئەو بەشە نەدراوە كە باس لە نەنگی و ناشیرینیەكانی دەكات.

ئەم رۆمانە تا هەنووكە تاقە دەقێكە بۆ گوزارشتكردن لە كۆی ئەو خەیاڵ و گومانەی كە لە رۆمانی «

مەرگی تاقانەی دووەم»ە وە نووسەر
دەستی پێکردووە و بە درێژایی هەموو
پرۆژەی خۆی لە بەرگ و شێوەی
جیاوزادا، بە کارەکتەر و رووداو و
تیمە و زمانی تازەوە، هەمووشی بۆ
من لەوەدا کۆ دەبێتەوە کە گومان لە
کۆی ئەم کەلتوورە و پیرۆزییەکانی
بکەین، دەکرێت ناوی بنێین گەشتێك
لە دیارەوە بۆ نادیار، لە جێگیرییەوە
بۆ لەقبوون، لە متمانەوە بۆ بێ
بڕوایی، دیارە پرۆژە فیکرییەکانیشی
ڕووی لە هەمان پرسیار و گومانە
و هەڵکۆڵینێکی مەعریفی قووڵ و
ڕەگاژۆ بووە، دژ بە هەموو یەقینە
سیاسی و کۆمەڵایەتییەکان جەنگاوە.
بڕ و بارستایی ئەوەی لە پشت ئەم
نەوتراوانەی خۆیان حەشارداوە،
یەکجار زۆرترە لە وتراوەکانی ناو ئەم
ڕۆمانە. ئەوە بێجگە لەوەی کە خودی
زمان هەرچەندە دەوڵەمەند بێت و
نووسەرەکەمان خاوەن فەرهەنگێکی
بە بەرەکەت و

ڕەنگاورەنگ بێت کە ئەوەیان بۆ من جێگەی گومان نییە، وەلێ
زمان وەك رووبەرێك بۆ دەربڕین گوزارشتکردن لەو جیهانەی کە
ڕۆمانەکە پێشکەشمان دەکات، بە بەراورد لەگەڵ واقیع خۆی کە
فرە ئاست و فرە ڕەهەندە، زمان بە هەموو پێوەرێك تاك ڕەهەندە،
گومانکردنی نووسەرانی پووچگەرا، بەتایبەتی شانۆنووسەکانیان
ئاماژەیان بۆ هەژاری زمان کردووە کە دەکرێت وا بێت یان نا،
گەرچی لەم دەقەدا زمان گەیشتۆتە دوا پەلوپۆهاوێشتنی خۆی
تاوەکو باوەش بە هەموو ئەو جیهانەدا بکات کە وەك ئەدەبی
داستانی ڕەسەن پایەکانی لەسەر خەیاڵ بەندن، خەیاڵ و
فانتازیایەك کە پردی پەڕینەوەی ئێمەیە بۆ ئەو واقیعە کوشندەیەی
نووسەر گەرەکییەتی هەر لە لاپەڕەکانی سەرەتاوە بۆ ئێمەی ڕەسم
بکات، کە لە تابلۆی کوشتنی ئەسپە نەخۆشەکانەوە دەست پێدەکات
تاوەکو دەگەینە سەر سووتانی کەشتی فریشتەکان.

پرسیاری ڕەخنەو وەڵامی دەق

گومانی تێدا نییە کە نووسەر/ هەقایەتخوان پێکەوە توانیویانە
هەموو گەمەکانی گێڕانەوە بەسەر ئێمەدا تێپەڕێنن و تەواو
تەماهی لەگەڵ لایەنی هونەرییەکەی بکەین، بڕوام نییە ئەوەیان
وەها ئاسان بێت و کە هەموو گەمە هونەرییەکە بۆ سیحری
گێڕانەوە بگێڕینەوە، چونکە کۆی ساختمان و پێکهاتەی دەقەکە
دەمانگێڕێتەوە ناو مێژوویەك کە لە یادەوەری هەمووماندا هێشتا
سەوزە، چونکە هەر لە سەرەتاوە دەزانین هونەریبوونی زاڵی
ڕۆمانەکە ئەوە ناشارێتەوە کە پێگەی هەر هەموو کارەکتەرەکان

بارگاوی بووە بە  ئایدیۆلۆژیا لە رووکەشدا و بەڵام ساختە لە ناوئاخن و گەوهەردا، پێگە جیاوازەکان
دەمانخەنەوە ناو ململانێیەك کە رۆحی شۆڕش توێ توێ دەکات و بە ئێمەی پیشان دەدات، لە بونیاتێکی
یەکانگیر، درامی و بەیەکداچوو، کراوە بەسەر پێگە جیاوازەکان و یان سازشکارەکان، هەر
هەمووشی لەناو مێژوویەکدا کە جێگەی شانازی بووە تاوەکو ئەمڕۆ، کەچی رۆمانەکە هەر
هەمووی دەخاتە ژێر پرسیار و گومانەوە و یەقینەکان هەڵدەوەشێنێتەوە، هەر هەمووشی
بە شەبەنگی فانتازیادا تێپەڕ دەبێت کە تاکە شێوەیەکە کە لە رێگەی ئەو سیحری خەیاڵ و
فانتازیاوە، ئەو سیحرە بەتاڵ بکاتەوە کە بۆ نیو سەدە زیاترە  شۆڕش هەر بەو سیحرەوە
هەموو گەمەکانی خۆی بەسەر ئێمەدا تێپەڕاندووە، ئەوەیان بەتەنیا لە رێگەی هونەرەوە
نەکراوە، بەڵکو لە پای پێگەی هەموو ئەو ئەکتەرانەی کە لەناو ئەو مێژووەدا، مێژووی
شۆڕش، نمایشکار بوون، ساز و ئامادە کراوە. لەوێدایە کە هونەری باڵای داستانبێژی
کە لەم رۆمانەدا بەرکەماڵە و خەیاڵ و فانتازیا بڕبڕەی پشتییەتی، دەتوانێت ئەو سیحرەمان
لێبکات کە پێچەوانەی ئەو هێزە زاڵەی شۆڕش بانگەشەی بۆ کردووە هەنگاو هەڵێنین و
جیاوازتر لەوەی کە باوە بیر بکەینەوە، ببێت بە دەقێك کە پێگەی خۆی ئەوەندە زاڵ بکات کە
دژ بوەستێتەوە لە بەرامبەر  هەر هەموو پیرۆزییە جێگیرەکانی شۆرشدا، هەڵبەت رۆحی هونەر
لەوەدا موعجیزەی خۆی نواندووە، وەلێ گەر دروست بڕوانین، گومانکردن لەو قۆناغە پیرۆزکراوە
لای زۆرینە بە هەڵکۆلینێکی بەردەوامی رۆحی رەش و شاراوەی شۆڕش دەست پێدەکات کە سیخناخە بە
ئیهامی تراژیدی، کە لە رووی سایکۆلۆژییەوە دووچاری دوو دۆخ دەبین؛ یەکەمیان گەڕانەوەیەکی خوێناوییە
بە یادەوەری خۆماندا کە هێدمەگرتی دەبین و دوچاری «شۆك» مان دەکات، یادەوەرییەك کە پڕە بە
رۆحی شەنگ و بێغەوشی شۆڕش کە بواری نەداوە جەهەننەمی ناوەوەی ببینین، دووەمیان قووڵبوونەوەی
نائومیدیمانە لەو بەرهەمەی کە ئەمڕۆکە هەیە و گوایە ڕەنجی ئەو شۆرشە بووە، لەوەدا «کەشتی
فریشتەکان» دەبێت بە گەشتی ئێمە بەناو زەریایەك لە خوێن و فرمێسك و ئارەقە و رەنجی بەباچوو،
کە ئەگەر زەمینەسازی بێت بەوەی لە رابردوودا نەوەیەك پێویستی بەوە بێت گومان لەو هەموو پیرۆزی
و یادەوەرییەی خۆی بکات کە فریوی خواردووە، ئەوە لەمرۆکەدا نەوەی تازە وەك نەوەی باوان پێویستی
بە یادەوەری نییە کە خۆی لەناو کەشتییەکەدایە و مەحاڵە بزانێت لە کام بەندەردا لەنگەر دەگرێت، ئەم



تێکستە بەتەواوی لە پێگەی زاڵی شۆرش دەدات و داغانی دەکات کە تا هەنووکە دوکان و بازاڕی فرۆشتنی خەون و ئومێدی دوارۆژی بۆ هەر هەمومان گەرم و پڕ لە جۆش و خرۆش بووە!

رۆماننوس بە ئیقاعی ئاسنگەرێك لە کارگەکەی خۆیدا کار دەکات کە دەتوانێت لە ئاسن و پاسنە بێکەڵك و ژەنگدارەکان و سیکرابخانەکەی مێژووی شۆرشدا نایابترین کەرەستە دروست بکات، لە هەموو دیمەنەکاندا ئەو گۆڕەپانەی شۆرش کایەی تێدا دەکات لە سیکرابخانە دەچێت، لە کۆتایشدا زیندانە هەرە جەهەننەمییەکەی ناوزەدکراو بە «بورج» وەك سیکرابخانەیەك بۆ مەردوومە بێ کەڵکەکانی ناو شۆرش زاری دەکاتەوە کە وەك پاشماوە و خاپەرۆکی شۆرش لەوێدا تا مردن تەقاوت دەکرێن، کە گەورەترین قوربانی ئەو سیکرابخانەیەی شۆرش «وەفای رەفعەت بەگ» خۆیەتی کە کۆیلەی ئەزەلی شۆرشەکەش بووە.  ئەوەی کە لەم دەقەدا بۆ شۆرشگێر و ناشۆرشگێر کەمەرشکێنە ئەوەیە: کە بەتەنها گومانکردنێك نییە لە رابردوو، رابردووی بە پیرۆزکراو، بەڵکو گومانکردنە لە هەنووکە و لە ئایندە، ئەمەیان داستانی بەتاڵبوونەوە و درۆی هەر هەموو دروشمەکانە کە لە نیو سەدە تێپەڕی کردووە بەو خەڵکەی دەفرۆشنەوە.

لە رۆماندا ، بۆ زۆرینەی خوێنەران، ئەوەندەی کە مەراق و حەزی پشکنین و ناسینی خەڵك و گرێ و نهێنییەکان ئاسوودە و تێریان دەکات، ئەوەندە شەیدای ئیستاتیکا و ماناو بایەخە هونەرکارییەکەی نابن، بەتایبەتی بۆ ژمارە هەرە زۆرەکەی خوێندەواران کە سەروکاریان لەگەڵ فۆرم و تەکنیك نییە، بەتایبەتی بۆ رۆمانێکی وەك «کەشتی فریشتەکان» کە سەرزەمینێکی کۆمەڵایەتی و رامیاری پڕ لە کارەکتەری سەیر و سەمەرەی خۆشکردووە کە وەکو زەمەنیش قۆناغێکی دوور و درێژ لەو ژیانە، بە هەموو رووداو و ململانێکانەوە، داگیر دەکات. ژیانێك کە نەوەیەکی هێشتا زیندوو پێی ئاشنان. گەرچی ئەوەیان هەرگیز بەو مانایە نایەت کە نووسەر پشتی لە هونەرکاری و فڕوفێڵەکانی تەکنیك کرد بێت. قسە لەسەر ئەوەیە کە هەر لە سەرەتای سەرهەڵدانی ئەو هونەرەوە، رۆمانی پەیوەست بە رەفتار و رەوشت و خوو و خدەی مرۆڤەکان، هەر فۆرم و تەکنیکێکی بەکارهێنا بێت، بایەخی یەکەمی بە دروستکردنی خەڵکانێك داوە کە کەموزۆر لە ئێمە دەچن یان تەواو پێیان نامۆین، گەرچی بە هەر دوو باردا بەوە سەرسامین



که نه خۆمان و نه ئەوانەی دیکەمان وەها بە وردی و قووڵی نەناسیوە، هۆیەکەشی ئەوەیە مەردوومەکان بەتەنها جوانییەکانی خۆیان دەبینن، دەنا نمونەکانی وەك نزار و بولبولیار و نەغەدە و شوکاك و لیڤیتانت و وەفای رەفعەت بەگ....هتد. لە هەموماندا هەیە. گەرچی هەمووان خۆ لەتەك «هۆشەنگ بولبولیار»دا بەراورد دەکەن وەك هەڵگری رۆحی فریشتەکان، نەك وەفا ـ ی سیخوڕ کە هەر زوو فریشتەکەی ناوەوەی گەرەکییەتی رابکات و لێی بترازێت، رۆحی وەفا لەناو هەموو کوردێکدا هەیە نەك وەك نمونەی سیخوڕ و خۆفرۆش، وەك ئەوەی هەموو ژیانی لەوە پێکهاتووە بزانێت ئەوانیدیکە چۆن دەژین و چی دەکەن و چییان هەیە... وەها ورد و بە سەلیقە و حەوسەڵە کە لەوە دەکۆڵێتەوە ئەخلاقی سێکسی و عیشقبازی و ناو پێخەفی ئەوانیدیکە بپشکنێت تاوەکو بزانێت چ جۆرێکە، رۆحی چاودێرێکی وەها شەیدا کە وەك دەعبایەکی هەزار چاو لە چواردەوری خۆی دەڕوانێت، پەیوەندی بەوەوە نیە هەواڵگرە و نهێنییەکانی دوژمنان بۆ شۆرش بدۆزێتەوە، یان نهێنی هاوڕێ هەرە نزیکەکانی خۆی کە گومانی ئەوەیان لێدەکات نەیاری شۆرش بن، بەڵکو ئەمەیان رۆحی هەمووومانە کە شێتی ئەوەین لە کونی هەموو دەرگاکانەوە سەیری ژیانی شاراوەی ئەوانیدیکە بکەین، چونکە خۆمان ناژین، بڕو بارستایی ئەو زەمەنەی کە بۆمان نەکراوە تیایدا بژین و لە خۆشییەکانی بێبەشین، گڕمان تێبەردەدات بۆ ئەوەی سیخوڕانە حەز بکەین بزانین ئەوانیدیکە چۆن دەژین و زیندەگی خۆمان بەراورد بکەین بە زیندەگی ئەوانیدیکە کە ئەوەیان رەوشتی دزەکانە.. دزی پارە پوول نا، دزی نەسرەوت و هەمیشەیی ژیانی تایبەت و شاراوە، لە هەمووی کوشندەتر ئەوەیە کە کارەکتەرەکانی ناو شۆرش بۆیان نەڕەخساوە وەك ئادەمییەکی تەندروست و خۆشبەخت بژین، دواتر و لە قۆناغی دوای ڕاپەڕین و ئازادی کوشتەی ئەوە دەبن کە خاك و خەڵکی پێکەوە داگیر بکەن وەك هەنووکە باوە و بۆتە سیاسەتی رۆژانە، هیچ کەسێك نییە لە ئێمە هەڵگری رۆحی «وەفای رەفعەت بەگ» نەبێت بە دیوە کۆمەڵایەتییەکەی ، چ کەم چ زۆر، بەڵام دۆزینەوەی بڕو بیانوو بۆ ئەو رەوشتە نزمەی دزئاسا لای ئێمە ئەوەندە زۆرە کە هەمیشە وەك وەفا وەریدەگێڕین بۆ نیازی پاك و خزمەت بە گەل و نیشتمان و پاراستنی قەڵای ئەخلاق کە شوورەکانی داڕزیون .

جوڵەی هەر هەموو کارەکتەرەکان هەر لە سەرەتاوە وەها نەخشەی کێشراوە کە دەزانین لە کوێوە بۆ کوێ دەچن، چی دەکەن، بۆچی و چۆن، چونکە شۆڕش و خوداکانی شۆڕش خاوەنی هەر هەموو نەخشەکەن، بەڵام بە درێژایی ئەو رۆمانە پاڵەوانەکان وەك ئەوەی کەوتبنە ناو توونی بابا و ونگەیەك کە سەرگەردان و وێڵ بەر یەکدی دەکەون، لەوپەڕی سەرکەوتن و وەدەستهێنانی ئازادیدا، پتر کۆیلە و ترسنۆك و خۆپەرست و شکستەباڵ دەردەکەون. گەر چارەنووسی پاڵەوانی کۆن ئەوە بووە کە رووبەڕووی مەرگ ببێتەوە، کەچی پاڵەوانی تازە ناچارە بەوەی شکستەکان بچنێتەوە و لەگەڵ ژیانێکی درۆزندا دەست و پەنجەی نەرم بکات، ژیانێك کە مەرگ بە هەزار شێوە خۆی پیشاندەدات بەبێ ئەوەی بەتەواوی بیکوژێت، هەر وەك ئەوەی لە «کەشتی فریشتەکان»دا دەیبینین.

هەر هەموو کارەکتەرەکان، بەوانەشەوە کە هێز و دەستەڵات پلە و پایە کۆڵەکەی بوونییەتی، ناڵێم رۆح و گەوهەر، گومانێکی گەورەیان لەوە هەیە کە خاوەن ناسنامە و ناوەرۆکی خۆیان بن، هەوڵ و تەقەللای پتریان بۆ پارەو دەستەڵات و هێز و ئافرەت هیچ نییە بێجگە لەپڕکردنەوەی ئەو خەرەندە بێبنەی وا لە رۆحی هەموویاندا، پەیوەندییەکی زۆر ناکۆك کۆیان دەکاتەوە، گەرچی چەقی بایەخی هەموویان هەر لە سەرەتاوە شۆڕش و نیشتمان و ئازادی خەڵکە، بەڵام سووتانی «کەشتی فریشتەکان» لە کۆتاییدا لەبەرامبەر بە پێوە وەستان و مانەوەی «بورج» ی ستەم کە رۆحی ئەشکەنجەخواز  و سزابەخشی شۆڕش پێیدەگات، بەڵگەی ڕمانی هەر هەموو خەونەکانە و درۆی هەبوونی ئیقاع و پەیوەندی نێوان ژەنیارەکانە لەو تیمەی کە خراپترین و نەشازترین سیمفۆنیایان ژەندووە. ئەوەی کە دۆڕاوە خودی شۆڕش نەبوو، بەڵکو ئینسانەکان بوون، تۆرانی فریشتەکان لە مرۆڤەکانیان و مەرگی زۆر و هەرزانیان لە دوا لاپەڕەکانی بەشی یەکەمی ئەم رۆمانەدا، دوا زەنگی ترسناکە کە وا لە منی خوێنەر دەکات بە درۆ چاوەڕوانی ئەوە نەبم لە بەشی دووەمدا کە هێشتا لە ناو خەیاڵ و باوەشی رۆماننوسدایە،کە فریادرەسێك دێت و عیسا ـ ی موعجیزە ئاسا فریشتە مردووەکان زیندوو بکاتەوە، هەر لە سەرەتاوە تا کۆتایی هیچ لاپەڕەو پاژێکی ئەم چیرۆکە ئومێدێکی تێدا نییە کە فریادرەسێك لە کۆتایی ئەم گەشتە چاوەڕێمانە، رەنگە جوانی ئەم دەقە لەوەدا بێت کە هەڵگری ئەو دیدگا تراژیدییەیە کە تا دوا هەناسە قامچییەکی پێیە و دوامان کەوتووە و لە هەر چرکەیەکدا داغانمان دەکات، ئەوەشیان نە بۆ نووسەر و نە بۆ ئێمە دۆخێکی «ماسۆشی» نییە کە لەزەت لەو هەموو خەم و خوێنە ببینین، بەڵکو نیگاری رەش و راستەقینەی ئێمەیە



وەك مێژووی ئێستاكێ كە خاوەن «بورج»ەكان وەك بەهەشت پێمانی دەفرۆشنەوە.

حوزەیران ـ تشرینی یەكەمی ٢٠١٢

پەراوێز و سەرچاوە:

- ئەم نووسینە پێشەكی كتێبێكە وەك خویندنەوەیەك بۆ رۆمانی «كەشتی فریشتەكان».
- زۆربەی ئەو دەستەواژە و رستانەی نێوان كەوانەكان كە بە بۆڵد و لار / **Italic** نووسراون لە ناوئاخنی رۆمانەكە وەرگیراون.
- كەشتی فریشتەكان ـ رۆمان/ كتێبی یان بەشی یەكەم ـ بەختیار عەلی ـ ٢٠١٢



# سزای بێتاوان و بیرۆکەی تاوان لە «دادگایی» کافکادا

کەریم پەڕەنگ

چی وامان لێدەکا کە پاش تێپەڕبوونی دەیان ساڵ بە سەر بڵاوبوونەوەی داهێنانێکدا هێشتا تینووی خوێندنەوەی بین و بە جارێك و دوو جار خوێندنەوەی تەسکینی دڵمان نەیەت و هەمیشە لە سەر ڕەفی کتێبخانەکانمان دایانگرین و بۆ چەندەم جار بیانخوێنینەوە. ئێمە بۆچی لە خوێندنەوەی «تاوان و سزا»ی دۆستەیەڤسکی، بۆچی لە «زۆربا»ی کازانزاکی، لە «شەڕ و ئاشتی» تۆڵستۆی تێر نابین. بۆچی شانۆنامەکانی شەکسپیر کۆن نابن؟ ئایا ئەو تێمایانەی لە داهێنانەکاندا تەتەڵە کراون کەمەندکێشمان دەکەن؟ یان لەو بەرهەمە ئەدەبییانەدا بە دوای چیدا دەگەڕێین. یەکێك لەو بەرهەمانەی بە چەند زمانی جیاواز خوێندوومەتەوە و هەرگیز لە لام کۆن نابن و لە ژیانمدا زۆر کتێبم

بەخشیوە یان لە بەر بێجێی فڕێم داوە، وەلی یەکێك لەو ڕۆمانانەی هەرگیز نەمتوانیوە و ئێستاش ناتوانم بڵێم ئەمە دوا جارە دەیخوێنمەوە و پێویستم پێی نەماوە «دادگایی» فرانتس کافکایە. کافکا ئەم ڕۆمانەی نزیکەی سەد ساڵ پێش ئێستا نووسیوە و تەواوی نەکردووە و پاش مردنی بڵاو کراوەتەوە. لە کاتی بڵاوکردنەوەی ئەم ڕۆمانەوە هەتا ئێستا سەدان دکتۆرانامە، تۆژینەوە و هەڵسەنگاندنی لە بارەوە نووسراوە، سەیر لەوەدایە زۆر کەم ڕوو دەدا دوو توێژەر هەمان ڕا و بۆچوونیان هەبێ. یەکێکیان دەڵێ لەو کاتەدا کە کافکا خەریکی نووسینی ئەم ڕۆمانە بووە کاتی جودابوونەوەی بووە لە مارەبڕەکەی و خۆی وەکو شکلێکراوێك دەبینێ، یەکێکی تریان دەڵێ ئەم ڕۆمانە لە کاتی جەنگی یەکەمی جیهانیدا نووسراوە و جەنگ کاریگەرییەکی زۆر نەرێنی بە سەر کافکاوە بە جێهێشتووە. هتد. کاری ئێمە نییە لێرەدا تیشك بخەینە سەر ئەو تیۆر و تێمایانەی لە بارەی کافکا و بەرهەمەکانییەوە هاتوونەتە ئاراوە، بەڵکو تەنیا دەمەوێ ئاماژە بۆ بەرفراوانی جیهانی داهێنانی کافکا بکەم کە زیاتر لە خوێندنەوەیەك هەڵدەگرێ.

ڕەنگ بێ کراوەیی دەقەکانی کافکا هۆیەك بێت بۆ ئەو خوێندنەوە جیاواز و زۆر جار بە یەك ناکۆکانە. کوندێرا لە بارەی کافکاوە دەڵێ: "ئەم فەنتازیایە ئەفسونم لێدەکا، بە بێ ئەوەی بە تەواوی بزانم لە کوێوە دێت. کافکا؟ بێگومان. بۆ سەدەکەمان ئەو بوو، کە مەحاڵی لە هونەری ڕۆماندا ڕەوا کرد."





ئەگەر ماکس برۆد نەبوایە، ئەمڕۆ ئێمە تەنانەت ناوی کافکاشمان نەدەزانی. یەکسەر پاش مردنی هاوڕێکەی هەر سێ ڕۆمانەکەی بڵاوکردەوە. بە بێ ئەوەی دەنگدانەوەیەکی زۆر بە دوای خۆیدا بهێنێ. برۆد تێگەیشت، بۆ ئەوەی کاری کافکا بسەپێنێ، دەبێ جەنگێکی ڕاستەقینەی درێژخایەن بەرپا بکا."

بوویەرێکی خەونی مۆتەکەیی ئاسا لە بەردەم خوێنەردا ڕوودەدا: دەستگیرکردنی گوماناوی مرۆڤێك، گوناهێکی ناڕوون و نادیار، بە بێ شکات، دادگاییەك کە پەی پێنابرێ، ڕووخسارێکی نادیار، یاسایەکی نەناسراو، نەبوونی بڕیاری دادگا، کوشتنێکی قێزەون. ئەمانە ڕەگەزە پێکهێنەرەکانی ڕۆمانی «دادگایی» کافکان کە لەم وتارە کورتەدا دەمەوێ وێستێکی لە بەردەمدا بکەم و چەند بیرۆکەیەکی لە بارەوە بوروژێنم و

ئەم چەند دێڕە وەکو تەواوکەرێك بۆ ئەو وتارە بنووسم کە عەتا نەهایی وەکو پاشەکی بۆ وەرگێڕانە کوردییەکەی نووسیوە.

لە بەراییدا دوای بڵاوبوونەوەی ڕۆمانی دادگایی، تۆژەر و ڕاڤەگەرەکان بۆ ئەوە دەچوون، کە دادگایی ڕۆمانێکی ئایینییە. ئایا بە ڕاستی دادگایی ڕۆمانێکی ئایینییە. لێرەدا دەتوانین بە ئەرێنی وەڵامی ئەم پرسیارە بدەینەوە. بەڵام ڕۆمانێکی ئایینی بە شێوەیەکی زۆر تایبەت و ناتەقلیدی. کافکا زۆر جدی مامەڵە لەگەڵ تێمای ئایین دەکا، بەڵام لە بەرامبەر ئایینی تەقلیدیدا زۆر بەدگومانە. زۆر جار وێنا ئایینییەکان دەگوازێتەوە بۆ ئەم دنیا، بۆ کۆمەڵگە، بۆ ژیانی ڕۆژانە.

هەوای ئەم ڕۆمانە ئەوەندە سافە، ئەوەندە پاکە، کە مرۆڤ هەرگیز ناتوانێ پڕ بە سییەکانی هەڵیمژێت! خوێندنەوەی ئەم ڕۆمانە خۆشییەك بە خوێنەر دەبەخشێ، مرۆڤ هەست بە ئارامییەك دەکا کاتێك نووسەر دەستی دەگرێ و بە ناو ڕێگومکە تاریکەکانی ڕۆمانەکەدا دەیگێڕێ و گوێی لە خۆی دەبێ پرسیار بە دوای پرسیاردا لە خۆی دەکا، بەڵام هیچ وەڵامێکی چنگ ناکەوێ. لێرەدا دەبێ بڵێم خوێنەرێکی زۆر هەن بە پێچەوانەی ئەم هەڵوێستەوە بە خوێندنەوەی دادگایی دەهری دەبن و لەو ڕێگومکەیەدا تووشی دڵتەنگی دەبن.

بێگومان بۆ ڕاڤەکردنی ڕۆمانی دادگایی کافکا وەکو دەقێکی ئایینی، یەکەم پەخشکاری واتە ماکس برۆد ڕۆڵێکی گەورەی گێڕاوە و ڕاڤەکەکارەکانی پاش ئەویش جێپێی ئەویان هەڵگرتووە.

ئەوەی دیارە دوو لایەندارییە کە مۆرکی هەموو ئاخاوتنەکانی برۆدن لە بارەی کافکاوە: لە لایەکەوە لایەنداریيە بۆ کەسی کافکا، کە برۆد هێندە بەرزی دەکاتەوە کە دەیخاتە سەرووی مرۆڤەوە؛ زۆر جار برۆد ئەمە بە گوزارشتی شەرمهێنەر گوزارشت دەکا، بۆ نموونە لە شوێنێکدا برۆد لە بارەی کافکاوە دەڵێ: «ئەگەر لە بەهەشتدا فریشتەکان نوکتە بگێڕنەوە، ئەوا دەبێ بە زمانی کافکا بیگێڕنەوە. ئەم زمانە ئاگرە، بەڵام هێس بەجێناهێڵێ. هەموو بڵندییەکی پانتایی بێکۆتایی لە خۆ گرتووە، لە گەڵ ئەوەشدا هەموو ڕاوەشاندنێکی بوونەوەر ڕادەوەشێ.» هاوشان لە گەڵ ئەم هەوڵەدا نووسەر و بەرهەمەکەی بۆ دەڤەری عیرفانی بەرز دەکرێتەوە. بە دوای ئەم لایەنداریيەی یەکەمدا لایەنداریی دووەم دێت بۆ ئەوەی یەکەم تەواو بکات: برۆد کارەکەی کافکا وەکو بەرهەمێکی دینی لێکدەداتەوە. وەکو نووسەرەکەی پاڵەوانەکەی ڕۆمانی «دادگایی»ش لە گەڕاندایە بە دوای

«دوا شتەکاندا»، بێئاکام هەوڵ دەدا، «شکۆدار» و بەهێزترین دەستەڵات، کە ژیانی پێیەوە وابەستەیە بناسێ.

وەکو هێمایەکی ئایینی، نمایشی گەڕان بە دوای خوادا لە ژێر کاریگەریی برۆددا ڕاڤەکارانێکی زۆر ڕۆمانی دادگاییان وەکو ڕۆمانێکی عیرفانی ڕاڤە کردووە و ئەوەندەی بە دوای هێما دینییەکانیدا گەڕاون، نێو هێندە دادگاییان وەکو دەقێکی کراوەی ئیساتیکی نەخوێندۆتەوە. ئایا ڕۆمانی دادگایی ڕەخنەیەکی ساتیرییە لە دادگا و بیرۆکراتی؟ بێگومان ڕۆمانەکە ئەم ڕەگەزانەی لە خۆ گرتووە. کافکا زۆر جار خۆی بە مۆرکە فرەکانی دەستەڵاتەوە لە ژیانی ڕۆژانەدا سەرقاڵ کردووە.

ڕۆمانی دادگایی بە یەکەم نیگا و ڕاگوزەر و ڕووکەش بە چیرۆکی هەڵەیەکی گرۆتێسکی دادگا دەچێ، لە دەقەکەدا هاتووە، ئەمە دادگایی نییە "لە بەردەم دادگایەکی ئاساییدا"




یوسف (ك.) کارمەندێکی پلەبڵندی بانکە، بەیانییەك لە سەر داوای دادگایەکی بەدگومان بە سەریدا دەدرێ و دەستگیردەکرێ، لە گەڵ ئەوەشدا هەست بە هیچ تاوانێك ناکات و هەرگیز پێی ناوترێ لە سەر چی دەسگیر کراوە. لەگەڵ ئەوەشدا کە گیراوە، دەتوانێ کارەکەی خۆی جێبەجێ بکات و ژیانی خۆی بە ئاسایی بگوزەرێنێ. لە گەڵ ئەوەشدا لەم بەشەی ڕۆمانەکەدا دادگا دەست وەردەداتە ژیانی (ك)ەوە و چەند جارێك ڕاپێچی دادگای دەکەن. بەڵام پاسەوانەکانیشی سزا دەدرێن، لە بەر ئەوەی (ك.) گازندەی لە دەستیان کردووە و تۆمەتباری کردوون بە مامەڵەکردنی خراپ لەگەڵیدا.

لە بەشی دووەمدا دادگا خۆی لە (ك.) بە دوور دەگرێ، یان بە لای کەمەوە وا دەردەکەوێ. (ك.) بە دڕدۆنگی و بێئامانج و بێئاکام هەوڵ دەدا هۆکاری دادگاییەکەی بزانێ و بگاتە ئەو دادگا نادیارە، بەڵام هەمیشە بە خەڵکگەلێك دەگات کە هیچیان بە دەست نییە یان پلە نزمن و هیچیان بە دەست نییە، یان نوقمی زۆنگاوی گەندەڵین. سەردانی دوو کەس دەکا گوایە کۆمەکی دەکەن، پارێزەرێکی جێی گومان و تابلۆکێشێکی دادگا، کە دەبێ لە داگادا پشتگیریی بکەن یان ڕاوێژکاری و ڕێگەنومایی بکەن. (ك.) لەو بڕوایەدایە لە ڕێی ناسیاوی و ئاشنایەتی لە گەڵ ژناندا کۆمککەری دۆزیوەتەوە. لە دواییدا (ك.) بەو

قەناعەتە دەگات، هەموویان بۆ دادگا کار دەکەن و سەر بە دادگان و گومانی سیخوڕبوونیان دەکا.

لە بەشی سێیەمدا (ك.) چاوی بە قەشەی زیندان دەکەوێ، لە گفتوگۆیەکدا قەشە چیرۆکی دەرگەوانی بۆ دەگێڕێتەوە، کە لەوانەیە وەکو دوا ئینزاری دادگا «یان وەکو سەرلێشواندنی یەکجارەکی» بیری لێکرابێتەوە. ساڵێك پاش دەستگیرکردنی لە کانەبەردێکی دووردا وەکو کوشتنێکی سرووتگەرا دەکوژرێ. (ك.) هەرگیز دادوەرەکەی نەبینیوە. لە سەرەمەرگدا خۆی "وەکو سەگ" دێتە بەر چاو.

یوسف (ك.) دەگات بە خاڵێك کە ئیتر بەرهەڵستی ناکات، خۆی ڕادەستی دادگا کردووە، خۆی بۆتە بەشێك لە دادگا، دنیا بە چاوی دادگا دەبینێ و بە ژیانی دادگا دەژی. ئەم دادگاییە ئاساییە و هەرگیز ئاماژە نەبووە. یەکسەر وەکو ڕەمز بەرنامڕێژیی بۆ کراوە، بە ڕاستی ئەو ڕەمزە خۆی ئازاد و ناوابەستە کردووە، ژیانی خۆی دەژی، بەڵام چۆن ژیانێك.

یوسف (ك.) هیچ تاوانێکی نەکردووە، بەڵام سزا تاوانی خۆی دەدۆزێتەوە نەك بە پێچەوانەوە، واتە هەموو چەقۆیەك گۆشتی خۆی دەدۆزێتەوە.

کافکا پێش کاتی خۆی کەوتووە و پێشبینی کردووە، لە وردەکاریی ئەمڕۆدا دۆزەخی سبەینێی بینیوە، واقیع بۆ خەونێکی ترسناك بەرز دەکاتەوە. ئەو کاتە وێنای ئەوەی کردووە کە دامەزراوەکانی دەستەڵات بە شێوەیەکی ترسناك خۆیان سەربەخۆ دەکەن، مەزەندەی زۆرینەی ئەو هەموو شتانەی کردووە کە دواییتر بوونە ڕاستی، ئەمەش تەنیا لە توانای نووسەرێکی هەستیاردایە، کە لە پشتی شتی ڕۆژانەوە سێبەری دژواری داهاتووی شتەکانی بینیوە.

لە ڕێی پووچگەرایی موبالەغەوە، خوێنەر بە نیگەرانییەوە بۆی دەردەکەوێ، ئەو دنیایەی تێیدا دەژی، وەکو دنیایەکی دڵگیر و قبووڵکراو ئەزموونی ناکا، بەڵکو وەکو دنیایەکی شێواو و لە گرێژەنە دەرچوو دەیبینێت.

لە دادگاییدا نووسەرێك دەبینین، کە بانگەشەی ئەوە ناکات هەموو شتێك بزانێ، دەستەڵاتدارێکی بە توانا نابینین کە هەموو شتێك بەرەو باشی و خۆشی ببات، تەنانەت لە نسکۆی پاڵەوانەکەشیدا ئۆخژن هەست پێبکات، لە کوشتندا زیندووبوونەوە ببینێ، نەخێر، بەڵکو نووسەرێك دەبینین کە ڕێی ونکردووە، نازانێ بۆ کوێ دەڕوا و نازانێ چۆن کۆتایی دێت.

کافکا بوویەرێکە بە زمانێکی زۆر مەترسیدار و پڕ وردەکاریی و مەوزوعی دەیگێڕێتەوە، ئەمەش ڕووداوە قێزەونە مەتەڵئاساکە بەهێزتر دەکا. کافکا لە یاداشتنامەکانیدا نووسیویەتی، نووسین بۆ من نمایشکردنی

ژیانی خەونئامێزی ناخمە. بەڵام ئەو پرسیارەی لە بەردەمدا قووت دەبێتەوە ئەوەیە، ئایا خەونی مۆتەکەیی ناتوانێ شتی ڕاست لە خۆ بگرێ. لەوانەیە کافکا ویستبێتی پووچگەرایی هەڕەشەکەری هەموو ژیانێك بگێڕێتەوە؟ لە ڕێی زیاد پێوەنانەوە دەبێ تۆپزییە نادیارەکان، کە تەنگەتاومان دەکەن، ڕێی ژیان لێ وندەکەن، بە لاڕێماندا دەبەن، دەربکەون.




پاش سەد ساڵ لە نووسینی ئەم ڕۆمانە ئێستاش خوێنەر دەکاتە دوو بەرەوە. گروهێك بە سەرساامییەوە کارەکانی قووت دەددا، دەیەوێ زانیارییەکی زۆر لە بارەی نووسەرەوە کۆ بکاتەوە، دەیەوێ لە پاڵنەرە ناوەکییەکان تێبگا بۆ نووسینی ئەم ڕۆمانە، گروهەکەی تر ڕەتی دەکاتەوە و وەکو ڕۆمانێکی قێزەون و دڵڕەقانە دەیخوێنێتەوە. بێگومان ئەم جەمسەرگەرییەی خوێنەران بۆ دوو بەرەی هاوپشت و دژ کە دەتوانی هەمان شت لە بارەی «نامۆ»ی ئەلبێر کاموی و «کچە پیانۆژەنەکە»ی ئەلفریدە یەلینەك و «عەتر» پاتریك زویسکیند و زۆر ڕۆمانی تریشەوە بڵێین.

لە ڕۆمانی «دادگایی»دا دەمامکی نهێنیی لە سەر ڕووی دادگا هەڵنەماڵرا. لەو کاتەدا کە (ك.) خەریکە بمرێ بەو قەناعەتە دەگات، کە ژیانی هەڵە بووە، بەڵام بە نادیاریی دەمێنێتەوە هەڵەکانی لە چیدا بوون. ڕەفتاری لە دیمەنی کوشتنە سامناکەکەیدا لە نێوان ڕازیبوون و یاخیبووندایە، لە نێوان هەست بە گوناهکردن و تروسکانەوەی بێئامانجی ئومێددایە.

وەکو دەزانین، کارێکی گرنگ ڕێی بە ڕاڤەی جیاواز و خوێندنەوەی جیاواز دەدا، تەنانەت ئەمە مۆرکێکی چۆنێتی کاری ئەدەبییە. ڕەنگ کارەکانی کافکا بە شێوەیەکی گشتیی و دادگایی بە شێوەیەکی تایبەتی ئەم قسەیەمان بسەلمێنن، لە بەر ئەوەی ئەگەری ڕاڤەی فرەی لە گەڵ خۆیدا هەڵگرتووە.

لە گەڵ ئەو هەوڵە زۆرەیش کە کافکاناسەکان داویانە بۆ ئەوەی یوسف (ك.) بکەنە فرانتس کافکا، دەبێ لێرەدا خۆمان لەو فریوە قورتار بکەین، کە ڕاڤەیەکی ژیاننامە بکەینە چرای دەستمان بۆ ڕووناککردنەوەی لایەنە شاراوەکانی ڕۆمانەکە؛ فریوێکی لەو بابەتە مەزنیی و جوانیی ڕۆمانەکە دەشێوێنێ و ڕێ بۆ سانا خوێندنەوەی دەقەکە خۆش دەکا. لە بەر ئەوەیش کە کافکا بارودۆخەکەی لە شێوەی خەونێك شێواندووە و نامۆی کردووە یان با بڵێین بەرفراوان کردووە، بەها و ماناکەی لە سەرووی تەنگژەی ڕاستەوخۆی نووسەرەوەن. کافکا ویستوویەتی بە نووسین لە هەست بە گوناهکردنی خۆی بکۆڵێتەوە و لە

بارەی باری دەروونی خۆیەوە بەرچاوڕوون بێت؛ بەڵام ترس و گوناه لە ئەزموونە بنەماییەکانی مرۆڤن، کە لە داڕشتنی ئەدەبیدا دەتوانێ ئەو خوێنەرانەش بدۆزێتەوە، کە تەنگژەکانیان لەوانەی نووسەر جیاوازن، کە لە پانتایی مەداری سێکس، تەنیایی، ترسی وابەستەیی و نووسیندا تەراتێن دەکات و لە دواییدا خۆی بۆ نووسین تەرخان دەکات.

فرانتس کافکا تەنیا پەخشانی نووسیوە. گێڕانەوەکانی دەقگەلی کورت و پڕمانا و زۆر چڕن و زۆر جار شێوەی قسەی نەستەقیان لە خۆ گرتووە. ئەو کارانەی کە پێش مردنی بڵاوکرانەوە زۆر بە ئەرێنی باوەشیان بۆ کرایەوە، بەڵام تەنیا بازنەیەکی بچووکی پسپۆڕان و هاوڕێی نووسەر پێیان دەزانین. لە دوای جەنگی جیهانی دووەم کارەکانی لە ئەڵمانیا بە جەماوەرێکی بەرفراوان گەیشتن. سەیر لەوەدایە کافکا بە زمانی ئەڵمانی لە پراگ دەینووسی بەڵام ناوبانگی لە ئەمەریکاوە بە سەر فەرەنسادا بە ئەڵمانیا گەیشت.

ڕۆمانگەلی («ونبوو»، «دادگایی»، «کۆشك») پاش مردنی کافکا ماکس برۆدی هاوڕێی بڵاوی کردنەوە، ئەمەش پێچەوانەی وەسیەتنامەکەی کافکا بوو، کە داوای لە برۆد کردبوو هەموو دەسنووسەکانی لەناوبەرێ. برۆد گوێڕایەڵی داواکەی کافکا نەبوو لە بەر ئەوەی قەناعەتی بە بەهای بەرزی میراتەکەی هەبوو. برۆد ئاماژەی بەوە کردووە، کە کافکا هێشتا مابوو پێی وتووە، گوێڕایەڵی وەسیەتنامەکەی نابێت.

شێوازی کافکا واقعییە، بەڵام ئەوەی داڕێژراوە زۆر جار هێندە لەبازبازێنێکی دژوار و بێمانایی خەونێکی مۆتەکەییدایە، کە مرۆڤ تووشی نامۆبوون دەکەن. لە کارەکانیدا شتی زۆت سامناك ڕوودەدەن: (ك.) ڕۆژێك لە ڕۆژان دەرگایەك لە کارەکەی دەکاتەوە و دەبێتە شایەدحاڵی سرووتی سزادانێکی سادیستی. فیگورەکان بە شێوەی خێو دەردەکەون، دوو لەت دەبن و دیار نامێنن. لە چیرۆکی «وەرگۆڕان»دا فیگوری سەرەکی بێدار دەبێتەوە و دەبینێ بۆتە دەعبایەکی زەبەلاح. بەڵام ئەم بوویەرانەی کە جێگای بڕوا نین، وەکو شتێکی زۆر ئاسایی و گومان هەڵنەگر دەگێڕدرێنەوە. کافکا هەمیشە وەکو ڕێخۆشکەری سوریالیزم هێمای بۆ دەکرێ. وەکو دەزانین تابلۆی «ماکس ئێرنست، سالڤادۆر دالی» و ئەدەبی «لویس ئەراگۆن، ئەندرێ بریتۆن» بوویەری خەونئامێز و فەنتازی و بەسەرهات زۆر بە وردەکاریی و نزیکە ڕاستیی نمایی کراوون، بەڵام ئەوەی مایەی سەرنجە و لە شوێنێکدا میلان کوندێراش ئاماژەی بۆ ئەوە کردووە کە سوریالیستەکان بۆ ڕۆمانەکانی کافکا نەگەڕاونەتەوە، بەڵام ئەوەی لە بەیاننانەی

سوریالیستەکاندا ئاماژەی بۆ کراوە کتومت بە سەر ڕۆمانەکانی کافکادا پێڕەو دەکرێن. لێرەدا چەند کارێکی تری کافکا بە خێرایی دەخەینە بەرچاوی خوێنەر:

«لە مۆڵگەی سزادا» کە لە ساڵی ١٩١٤دا نووسراوە و لە ساڵی ١٩١٩ بڵاو بووەتەوە سەربازێك لە بەر هەڵەیەکی بچووك و بێمانا دەبێ لە بەردەم فەرماندارەکەدا بە ئامێرێك هەتا مردن ئەشکەنجە بدرێ. دەقی بڕیارەکەش دەبێ پیت بە پیت لە سەر جەستەی هەڵبکۆڵرێ.

«لە بەردەم یاسادا»، لە ساڵی ١٩١٤دا نووسراوە و لە ساڵی ١٩١٥/١٩٢٠دا بڵاو بووەتەوە. ئەم چیرۆکە بەناوبانگە، کاکڵی «دادگایی» پێشووتر وەکو چیرۆکێکی سەربەخۆ بڵاوبووەتەوە. لە یاداشتنامەیەکی ساڵی ١٩١٤دا دەڵێ کە کافکا ئەم چیرۆکەی زۆر لە لا خۆشەویست بووە و وەکو «داستان» ناوزەدی کردووە و باسی هەستی خۆشی و بەختەوەری دەکا.

«کۆشك» لە ساڵی ١٩٢٢دا نووسراوە؛ لە ساڵی ١٩٢٦دا بڵاو بووەتەوە هەروەکو چۆن لە «دادگایی»دا یوسف (ك.) بۆی نالوێ بە دادگا بگات، فیگوری سەرەکی «کۆشك» کە تەنیا ناوی (ك.)یە بەو مرازەی ناگات، فەرمانگەی کۆشك وەکو مەساح دایبمەزرێنێ. ئەم ڕۆمانە تەواو نەکراوە، بەڵام دەبوو (ك.) ماوەیەکی کورت پێش مردنی ئەو هەواڵەی پێبگا، کە مافێکی یاسایی بۆ دامەزراندنی لە ئارادا نییە، بەڵام لە بەر ڕەچاوکردنی چەند هۆکارێك دەتوانێ لێرە بمێنێتەوە و کار بکات.

لە گێڕانەوەی یەکڕوانگەییدا دەتوانین جیاوازیی لە نێوان سێ ئەگەری گێڕانەوەدا بکەین:

گێڕانەوەی ئەوکتۆریال،

منە ـ گێڕانەوە،

گێڕانەوەی کەسایەتی.



لە گێڕانەوەی ئەوکتۆریالدا گێڕەرەوەی هەموو شتزان ڕووداوەکان ڕاڤە دەکا، ئاماژە بۆ ئەو شتانە دەکا کە لەمەودوا دەگێڕدرێنەوە یان پێشدەستیی دەکا. ئاگای لە هەموو پەیوەندییەکانی ناو ڕۆمان هەیە و لە هەموو فیگۆرەکان زانیاریی زۆرترە.

ئێمە لە کاتی خوێندنەوەی ڕۆمانی «دادگایی»دا بە هیچ شێوەیەك هەست بە گێڕەرەوەی هەموو شتزان ناکەین. کافکا گێڕانەوەی کەسایەتی بەکار دەهێنێ، کە باسی کەسی سێیەم دەکرێ، بەڵام تەنیا لە دیدی تەنیا کەسێکەوە. ئەم مۆرکە ڕوون و ئاشکرا فۆرمی ئەم شێوە گێڕانەوەیەیە، چونکە لە یەککاتدا گێڕەرەوە کردەنی فیگەرە سەرەکییەکەیە. لە جیاتی ڕاڤەی پێشهاتی ڕۆمانەکە بکات و باسی بیرۆکەی هەموو فیگورەکان بکات، گێڕەرەوە تەنیا باسی بیرکردنەوە و ڕەمڵەکانی یوسف (ك.)مان بۆ دەکا، لە هەستەکانیشی تەنیا ترسە نادیارەکان بەیان دەکا. ئەمە گێڕانەوەی تاکڕوانگەیی یان ڕوانگەی یەکمانایی پێدەوترێ. لە ڕۆمانەکەی کافکادا لەوە زیاتر نازانین لەوەی کەسە سەرەکییەکە پێمانی دەڵێ. لە بەر ئەوەشە لە هەموو شوێنێك ئامادەیە. لە نائامادەیی ئەودا هیچ شتێك ناگێڕدرێتەوە.

بەڵام چەند ڕیزپەڕییەك لە شیوازەی گێڕانەوەی ڕۆمانەکەدا بەدی دەکرێ، بێگومان ئەمە ناتوانێ هیچ لە بنەماکە بگۆڕێ. لە سەرەتای بەشی کۆتاییدا بوویەرگەلێك دەگێڕدرێنەوە ـ گەیشتنی دوو بەڕێز و سرووتی نەزاکەت لە بەردەم دەرگا، کە (ك.) لەوێ ئامادە نییە.

ڕەنگ بێ پرسیار لە خۆمان بکەین بۆچی نووسەرێك ئەو تەکنیکی گێڕانەوەیە بەکار دەهێنێ. نابێ ئەوە فەرامۆش بکەین کە ئامرازەی گێڕانەوە لەوە پڕ گەنگەشە ترە نووسەر بە ئارەزووی خۆی هەڵی بژێرێ. دەتوانین وەکو وەڵام بۆ پرسیاری وەزیفەی تاك ڕوانگەیی گێڕانەوە ببینین،

کاتێك نووسەرێك ئەم تەکنیکە هەڵدەبژێرێ ئەو قەناعەتەی لە دەستداوە کە مرۆڤی مۆدێرن بتوانێ لە هەموو هاوپەیوەندی و گۆڕانکارییەکانی دەور و بەری تێبگات، کە چارەنووسی دیاری دەکەن، یان بتوانێ بە ڕاستییەکی بنەبڕکەر بگات. کافکا لەم لایەنەوە لەو نووسەرانە مۆدێرنترە، کە «بە لای کەمەوە لە ڕۆمانەکانیاندا» بانگەشەی ئەوە دەکەن، هەموو شتێك دەزانن. تاکڕوانگەیی گێڕانەوە پشکدارە لە بە مەتەڵئاساکردنی دەقدا. کاتێ خوێنەر بۆی دەردەکەوێ، کە دیدی (ك.) سنووردارە، ناتەواوە و تا ڕادەیەك هەڵەیە، نزیکبوونەوە لە وتەی ڕۆمانەکە شیاو دەبێ. ئەنجامەکانی گێڕانەوە لە نیگای تاکڕوانگەییەوە ئەوەیە کە خوێنەر لە فیگوری سەرەکی شت زۆرتر نازانێ، خوێنەر لە گەڵ فیگوری سەرەکیدا دەژی، ڕووداوەکان دڵتەنگی دەکەن، لە بەر ئەوەی لەم جۆرەی گێڕانەوەدا ڕوونکردنەوە و بیروڕا جێگایان



نابێتەوە، ڕاڤەیەکی ڕوون و ئاشکرا قورس دەکات.

خوێنەر ناچار دەکرێ، شپرزەیی (ک.) ئەزموون بکا، چ هەوڵی داماوانەی ڕوونکردنەوەکانی بۆ ڕووداوەکان، چ نائومێدبوونەکانی، بە بێ ئەوەی لە (ک.) زیاتر لە بارەی ئەو «دادگا» سەیرەوە شت بزانێ. ئەوەی لەم هاوپەیوەندییەدا بە ناوبانگە، ڕستەی سەرەتای ڕۆمانەکەیە، کە ئەوەی ئێمە لێرەدا مەبەستمانە بە باشی ڕوون دەبێتەوە. سەیری "دەبێ"یە بکە، کە گوزارشت لە مەزەندەیەك دەکات و هەروەها کرداری "کردبێ" و کە ئێمە پشت بەم مەزەندە و ئەگەرانە دەبەستین کە بوونەتە هۆکاری دەستگیرکردنی یوسف (ک.) لە دەقە کوردییەکەدا بووەتە حەتمەن، ئەم حەتمەنەی یەکەم وشەی وەرگێڕانە کوردییەکە سەرجەمی کاکڵی ڕۆمانەکەی پووچ کردووە،. ئێمە لەوە زیاتر نازانین، ئێمە هیچ هۆکارێکی مەوزوعی بۆ گرتنەکەی (ک.) نازانین. «دەبێ کەسێك زمانی لە یوسف (ک.) دابێت، چونکە بە بێ ئەوەی کە شتێکی خراپی کردبێ، بەیانییەك دەسگیر کرا.» ئەو کردارانەی من هێڵم بە ژێردا هێناوون گوزارشت لە مەزەندە، ڕەمڵ دەکەن، دەتوانین ئەو ‹دەبێ›یە بە وشەی لەوانەیە جیگۆڕکێ پێبکەین. ئەگەر بڵێین: «حەتمەن کەسێك بوختانی بۆ یوزف (ك) کردبوو، چونکە بێئەوەی تاوانێکی کردبێت، بەیانییەك هاتن و دەستبەسەریان کرد.» ئەوا بە دڵنیاییەوە دەزانین کە کەسێك بوختانی بۆ یوسف (ک.) کردووە و ئەمەش هۆکاری گرتنەکەیەتی و ئاو بێنە و دەست بشۆ، ئیتر پێویست ناکات ڕۆمانەکە بخوێنینەوە. من لێرەوە ئیتر باسی وەرگێڕانە کوردییەکە ناکەم، چونکە ئەم یەکەم وشەی دەستپێکە تاقە هەڵە نییە لە وەرگێڕانەکەدا، بەڵکو هەڵەی زۆر زەقی تری تێدایە کە کاریگەرییان لە سەر ناواخن و تێگەیشتنی ڕۆمانەکە هەیە. بێگومان ڕووی ڕەخنەشم لە عەتا نەهایی نییە. چونکە ئەو لە زمانی فارسییەوە ڕۆمانەکەی وەرگێڕاوە.

ئەوەی بە دوای ئەم دێڕەدا دێ هەتا کۆتایی ڕۆمانەکە تەنیا دیدی (ک.)یە لە بارەی دادگایی کردنی و پرسیارە دڕدۆنگەکانمان دەخرێنە بەرچاو.




کافکا بەشێکی زۆری ئەم ڕۆمانەی لە گەرمەی شەڕی یەکەمی جیهانیدا نووسیوە و پێویست بەوە ناکات لێرەدا بە تایبەتی ئاماژە بۆ ئەوە بکەین، کە دەقێك لە ناو گرمەی تۆپ و دووکەڵی بارووتدا

نووسرابێ بە بێ کاریگەریی دەرکەوتەکانی جەنگ نابێ.

یوسف (ك.) لە کاتی دەستگیرکردنیدا بە تووڕەییەوە ناڕەزایی دەردەبڕێ: ئەو «لە وڵاتی یاسادا دەژی، لە هەموو جێیەك ئاشتیی سەروەرە، هەموو یاساکان سەردەستن». لە ئەوروپا جەنگ لە گەرمەیدا بوو و نووسەر لەوێدا بە زمانی فیگورە سەرەکییەکەیەوە باسی ئاشتی و دەوڵەتی یاسا دەکا. پشتینەی بارودۆخی مێژوویی بە دەستی ئەنقەست بە ڕووکەش ئافەرۆز دەکرێ. ئاوەژووکردنەوەی ڕاستیی لە زۆر شوێنی تری ڕۆمانەکەشدا بەدی دەکرێ، بەڵام ئێمە نازانین مەبەستی کافکا خەفە کردنی ڕاستییە یان سینیکی بە دەمی فیگۆرەکەیەوە ئەم قسانە دەکا.

ماوەیەکی زۆر ئەم ڕۆمانە تەنیا وەکو ساتیرێکی پادشانشینی نەمسا ـ هەنگاریا سەیری دەکرا. کاتێك دەستەڵات لە دەستی بنەماڵەکەیدا کۆ دەبێتەوە زۆر جار شتی لێوە پەیدا دەبێ کە مایەی پێکەنینە، بە تایبەتی ئەگەر ئەندامانی ئەو بنەماڵەیە لە سیاسەتدا بێئەزموون بن و تەنیا لە بەر ئەوەی ئەندامی ئەو بنەماڵەیەن بەو پێگەیە دەگەن.

بەڵام کافکا ویستی ئەم ڕۆمانە وەکو ڕووبەڕووبوونەوەی کێشەکانی سەردەمی تازە بنووسێ، کە تەلەفۆن، ئامێری نووسین و ترومبێل بووبوونە دەستکەوتگەلێکی ئاسایی کۆمەڵگەی مۆدێرن. ئەم دۆزینەوە تا ڕادەیەك نوێیانەی تەکنیك لە هەموو بەشێکدا باسیان دەکرێتەوە، کە لە کاتی دەرچوونی ڕۆمانەکەدا بە ڕاستی دەبێ نائاسایی بۆ خوێنەر دەرکەوتبێ. بە پێچەوانەوە ئەمڕۆ لە ڕێی ئەم ناوزەدکردنانەوە بۆمان دەردەکەوێ، ئەم ڕۆمانە ئەو کاتە چەند مۆدێرن بووە و ئێستاش هیچی لە مۆدرێرنی خۆی لە دەست نەداوە.

«جیهانی دادگا»ی کافکا گشتگر و بەرفراوانە، لە بنەمادا لەو وێنایە زۆر جیاوازە کە ئێمە بۆ «دادگا» هەمانە: لەم ڕۆمانەدا یاسادانان، دادوەریی و جێبەجێکار لە یەکتر جودا ناکرێنەوە؛ کۆمەڵگایەکی چاودێریی تۆتاڵ نمایی دەکرێ. تەنانەت پارێزەرەکەش وەکو کۆیلەی دادگا دەردەکەوێ، نەوەك وەکو داکۆکیکار لە شکاتلێکراوەکە. (ك.) لەو شوێنەشدا بە هەڵەدا چووە، کە بڕوای بە دەوڵەتی یاسا هەیە، کاتێ خۆی خەریکە لە ناو دەچێ. کافکا کۆمەڵگەیەك نمایش دەکا، کە دادگا دەستدێژیی بۆ هەموو بوارەکانی ژیان دەکا.

هەر لە بەر ئەم تایبەتمەندیی لە شێوزا و ناوەڕۆکدایە کە خانەبەندکردنی کافکا لە مێژووی ئەدەبدا شیاو نییە. ئەو چیرۆکەکانی لە

پەخشگەلێك بڵاوكردنەوە، كە بەرهەمی تەعبیرییەكانیشی بڵاودەكردەوە و هاوڕێیەتی خەڵكگەلێكی دەكرد، كە ئەو كاتە نامایی مۆدێرنترین تەوژمی ئەدەبییان دەكرد.

وەكو پێشووتر ئاماژەمان پێكرد ڕاڤەیەكی بنەبڕكەر بۆ ڕۆمانەكە ناكرێ. «دادگایی» ڕۆمانێكی فرە توێژ و فرە مانایە. ڕەنگ بێ هەر ئەم ئەگەرە جیاوازانەی ڕاڤە بێت ئەم ڕۆمانە بكەنە بەرهەمێكی سەرسامكەر و بەهای ئەدەبی پێببەخشن.

گوناە، تاوان، سزا، قوربانیی، ئەم چەمكانە سەر بە فەزای ئایینن. زۆر لە ڕاڤەكاران هەوڵیان داوە ڕەهەندێكی ئایینی بەم ڕۆمانە ببەخشن، یان بە تۆپزی پۆشاكێكی ئایینی بەبەردا بكەن. لە ڕێی ئەو یاداشتنامانەوە كە كافكا نووسیونی دەزانین، كە كافكا مرۆڤێك بووە هیچ پێڕەكارێكی ئایینی نەبووە بەڵام زۆر لە ژێر كاریگەریی ئایین و تیۆریی و ڕەوتە عیرفانییەكانی ئایینی جودا بووە.

بێگومان وەكو شێوە و پاڵنەر ناتوانرێ كاریگەریی ئایین فەرامۆش بكرێ: بە پێی حیكمەتی نهێنیی جوولەكە، دادگای ئاسمانیی هەن، كە هەمیشە بە نهێنی كۆبوونەوە دەكەن و بەشێوەیەكی چاوەڕوانەكراو داوای پاساو لە هەموو كەسێك دەكەن: لە ڕێی خەونی مۆتەكییەوە، لە ڕێی نەخۆشكەوتنەوە، لە ڕێی مەرگەوە. كاتێك (ك.) یەكسەر دوای گرتنی سێوێكی جوان دەخوا ئاماژەیە بۆ حاڵەتی گوناهكردنی ئادەم. وەعزەكانی قەشەی زیندان بە وردەكارییەكانی ئایینی مەسیحی و ئایینی یەهودی دەچن. پێش ئەوەی بیكژین (ك.) هەردوو دەستی بەرز دەكاتەوە وەكو چۆن موسا لە كاتی نوێژدا بەرزی كردوونەتەوە.

بێگومان ئەم كاریگەرییانە لە ئارادان، بەڵام ڕاڤە ئاینییەكان زۆر ڕۆیشتن. لە ڕەگەزە ئایینی و ئاماژەكانەوە پەیامێكی ئایینیان هەڵهێنجا: بەس ئەوەندە بەسە (ك.) دان بە گوناهەكانیدا بنێ، ئەمجا فریادڕەس دەبێ. لە جیاتی ئەوە بە درێژایی ڕۆمانەكە مكوڕانە لە سەر بێتاوانیی خۆی سوورە، تەنانەت دەیەوێ سەرجەمی مرۆڤایەتی لە هەموو گوناهێك پاك بكاتەوە: چۆن مرۆڤێك دەتوانێت گوناهبار بێت. ئێمە هەموو مرۆڤین، هەر كەسە و وەكو ئەو تر. بەڵام گوناهی (ك.) لەو كەللەڕەقییەدایە.

بۆ زۆر ڕاڤەكار دادگا یەكسانە بە دادپەروەریی خودا.

من پێم وایە ئەمە لاوازترین و بێبنەماترین ڕاڤە بێت، نوانگەكانی دادگا یەك لە یەك گەندەڵترن.



ئەگەر دادگا بە ڕاستی بە دادپەروەریی خودا یەکسان کرابێ، ئەوا دەتوانرێ بەشێکی زۆری ڕۆمانەکە وەکو کوفر سەیر بکرێ. بەڵام کوفرکردن لە کافکاوە دوور بووە، لە نووسینەکانیدا هەمیشە بە ڕێزەوە باسی ئایین و پەروەردگاری کردووە.

ئەو ڕاڤەکارانەی، لەو بڕوایەدان، کە کافکا لە ڕۆمانەکانیدا زیاتر بیرۆکەی گنۆسی ڕەنگ پێدەداتەوە زۆرتر ڕێی دەچێ، گنۆسی تەوژمێکی ئایینی کاریگەری چاخە کۆنەکانە، بە قەناعەتی گنۆسییەکان خوایەکی باشی ڕووناکی هەیە «ئافرێنەری ڕوحی مرۆڤ» و خوایەکی بەد هەیە، کە مادەی شەیتانی خوڵقاندووە، بە پێی ئەم بیرۆکەیە شتگەلێکی زۆر خۆیان دەخەنە نێوان ڕۆحی مرۆڤ و خوداوە، ئەمانە خێو، نوێنەری شەیتان یان خودایەکی بەدن، واتە جیهانێکی هەتا بڵێی گوناهبار، کە پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆ لە نێوان مرۆڤ و خودای خۆشەویستیدا مەحاڵ دەکەن. ئەمە لە ڕۆمانەکەدا گەندەڵیی فەرمانبەرە بچووك و دەست و پێوەندی دادگا ڕوون دەکاتەوە. لە بارەی بەرزترین «دادگاوە»وە واتە پەروەردگار لە ڕۆمانەکەدا ڕاستەوخۆ هیچ ناوترێ.

ڕەنگبێ باشتر بێت پڕکێشیی ئەوە بکەین و هەوڵی ڕاڤەی ئەم ڕۆمانە لە دەرەوەی ئایین بدەین: بە پێی ڕاڤەی نیهیلیستی دەتوانین کافکا بە نووسەری سەرلێشێوان ناوزەد بکەین، کە هەمیشە بە دوای پرسیاری دڕدۆنگی بێوەڵامدا وێڵە. لە کەسایەتی یوسف (ك.)دا نسکۆی مسۆگەری مرۆڤێك پیشاندەدرێ، کە دەیەوێ بچێتە بنجوبنەوانی ئەو دنیاوە. لە کۆتاییدا یوسف (ك.) لە بەر ویستە خەیاڵاوییەکەی لە سەردەمێکدایە، کە تیایدا «خودا مردووە». کافکا پیشانی دەدا، مرۆڤ چۆن لە لە کاتێکی دوور لە خودا دەژی، بەڵام ڕۆمانەکە بە پرسیاری بوونی خوداوە خۆی سەرقاڵ ناکات. هەمیشە ئاماژە بۆ ئەوە کراوە، کە کافکا گومانگەر بووە و وتوویەتی، ئەمڕۆ ئیتر ناتوانرێ هیچ شتێك لە بارەی خودا و ئەو دنیاوە بوترێ. شتی خودایی تەنیا لە چەند چاوتروکاندنێکی کورتدا پیشانی مرۆڤ دەدرێ، ئەم چاوترکانانە ئەوەندە کورتن کە مرۆڤ درفەتی بۆ نارەخسێ بیری لێ بکاتەوە.

لێرەدا کە ئاماژە بۆ ئەم ڕاڤە پێچەوانەی ئایینییە دەکەین پشتمان بە تیۆری عەدەمیەت قایمە: بە پێی ڕاڤەی نهیلیستی «عەدەمیەت» کافکا نووسەری دەستەوەستانییە، نووسەری پرسیاری بێوەڵامە. ئەوەی وامان لێدەکا بتوانین ئەم بانگەشەیە بکەین ئەو بڕگانەن کە لە چەند شوێنێکی ڕۆمانەکەدا هاتوون، وەکو زۆر جار بە شێوەی بازنەیی ڕێکردنی (ك.)، وەسفکردنی دالآنە ڕێگومکەئاساکان،

که تەم یان دیوار ڕێی لێدەگرن نیگا بە سەر پەنجەرەکان بکات، یان دەستەکوتێی (ک.) لە تاریکیدا. وەکو دەزانین پەنجەرە ئەگەرێکە بۆ بینی ئاسۆ و تاریکیش نابینایی.

لە کەسی یەسف (ک.)دا نسکۆی حەتمی مرۆڤێك پیشاندەدرێ، کە دەیەوێ لەو دنیا تێبگا. ئەوەی کافکا دەیەوێ پیشانی بدات، عیرفانییەکی نابەستەیە بە ئایینەوە، کە هەستی بە گوناهکردن و فیگورەکان سرووتە ئایینیەکان بۆ خۆیانی دەهێڵنەوە و شتێکی وایان لە بارەوە بەیان ناکرێ تاکو ببنە دەسکەلا بۆ ئێمەی خوێنەر.



لەوانەیە ڕاست بێت، کە کافکا بە شێوەیەك لە شێوەکان باس لە خوا یان ئەو دنیا بکات، ئەمڕۆ ئەمە بۆ خەڵکێکی زۆر تەنیا شیاو دەردەکەوێ. تەنیا بتوانن بڵێن خودا چی نییە، بەڵام ناتوانین هیچ وەسفێکی کۆنکریتی بۆ چییەتی بکەین. بەڵام ڕاڤەی گومانکەر مانای ئەوە نییە، کە ڕۆمانەکانی کافکا بۆ مرۆڤی ئیماندار ناتوانن هیچ مانایەکیان هەبێ. بە پێچەوانەوە زۆر مرۆڤی ئیماندار بۆ لای خۆیان ڕادەکێشن و پێی سەرسامن.

لێرەدا دەبێ ئاماژە بۆ ڕاڤە و خوێندنەوە سیاسییەکانیش بکەین، کە گوایە کافکا واقیعبینێکی پێشبینکەر بووە و لە ساڵی ١٩١٤دا لە کاتی سەرهەڵدانی ڕۆمانەکەدا بە هەستیارییەکی زۆرەوە پێشبینی دیکتاتۆرەکانی دواییتری کردووە: تیرۆری فاشی و تیرۆری کۆمۆنیستی، کە لە سایەیاندا زۆر جار کەس نەیزانیوە چییان لێ داوا دەکرێ و لەبەرچی وایان لێ داوا دەکرێ، بەڵام ڕەچاونەکردنی ئەم داواکارییانە بۆتە هۆی لەناوچوونیان. کافکا لە کارەکانیدا ئەو کەشەی ڕەنگ پێداوەتەوە کە دوای هاتنە سەر حوکمی هیتلەر لە ئەوروپا سەردەست بوو. یوسف (ک.) لە بەردەم دادگادا کە دادخوازی دەکا ئاماژە بۆ ئەوە دەکا کە حاڵەتەکەی ئەم تەنیا حاڵەت و دانسقە نییە، بەڵکو ئاماژەی دادگاییەکە کە دژی زۆر کەس پێڕەو دەکرێ . بە وردیی وەسفکردنی جلە ڕەشەکانی پاسەوانەکان، دەڵێی نازییەکان ڕۆمانەکەی کافکایان خوێندۆتەوە و جلی پۆلیس و گێستاپۆیان لە بەر دوریوە. «من بۆ تێهەڵدان دایانمەزراندووم، کەواتە تێهەڵدەدەم» . ئەمە قسەی کوتکوەشێنەکەیە. ئەم وەڵامە هاوشێوەیە لە گەڵ ئەو وەڵامانەی، کە کارمەندانی ئۆردوگای لەناوبردنی ئەڵمانی لە کاتی لێکۆڵینەوەدا دەیانوتەوە .

لە بەر ئەوە جێگای سەرسوورمان نییە، کە لە وڵاتە بەناو کۆمۆنیستەکاندا کارەکانی کافکا قەدەغە بووە و بە دزییەوە دەخوێندرایەوە. هاووڵاتیانی وڵاتە دیکتاتۆرەکان هەمیشە لەو ترسەدا دەژین لە ژێر چاودێریدا بن، لە ڕۆمانەکەی کافکاشدا هەمیشە هەست بە ترسی فیگورە سەرەکییەکە دەکەین کە لە ژێر چاودێریدایە.

بەڵام لە دەوڵەتە دیمۆکراتییەکانیشدا دامەزراوی بیرۆکراتی زلکراو زۆر جار بۆ هاووڵاتیان ناشەفاف دەمێنێتەوە، هەرچی چەندە دەوڵەت هەوڵی کۆنتۆڵکردن و ڕامکردنیان بدات. چەندان جاربوونەوەی لە کۆتایی نەهاتووی دەرگاوانەکان، دەستەڵاتدارەکان، کە وەکو دادوەر لە هەورەبانەکاندا دەژین، ساتیری بیرۆکراتی ناوابەستەیە. بەشداربوون لە دەستەڵاتدا، کە قەناعەتی مکوڕ بە گرنگیی بەو کارمەندانە دەبەخشێ کە لە خواری خوارەوەی هەرەمەکەدان بۆ هەموو ئەوانەی کە ڕۆژێك لە ڕۆژان کاریان بە فەرمانگەیەك بووبێ ڕوون و ئاشکرایە، یان هەوەسبازیی فەرمانبەر لە فەرمانگەکاندا بە جوانی دەبینرێ. بە بێ هۆ نییە کە وشەی جوانی «کافکایی» ببێتە دەستەواژەیەکی مۆدە، کە بیرۆکراتی مۆدێرنی ڕێگومکەری هەرەشەئامێزی پێ ناوزەد دەکرا، دواییتر بە مانایەکی کاڵتر بە شێوەیەکی گشتی بۆ بارودۆخێکی ناڕوون و مەتەڵئاسا بەکا دەهێنرا.

وەکو گەمەی پشیلە و مشك فەرمانگەیەك هاوڵاتیان دەچەوسێنێتەوە، خۆی بەهێزتر لە خۆی پیشان دەدا یان لەوە بەدەستەڵاترە کە مرۆڤ مەزەندەی دەکات. ئەم ڕۆمانە پێش نزیکەی سەد ساڵ نووسراوە، بەڵام ئەو فەرمانبەرانەی لە فەرمگانگەکانی خۆیشماندا هەمان ڕەفتار دووبارە دەکەنەوە. زۆر ئاسایی ئەگەر ئەمڕۆ هاوڵاتییەك لە شارێکی کوردستان ڕێی بکەوێتە فەرمانگەیەك و دەربکرێتە دەرەوە، یان بە بێ هۆ پێی بڵێن هەفتەی داهاتوو وەرەوە، یان بەڕێوەبەر لێرە نییە و کەسی تر بۆی نییە واژۆی بکات، بەڕێوەبەریش لە دەرەوەی وڵاتە یان لە حەجە و سێ هەفتەی تر دێتەوە.

«دادگا» دەستەڵاتێکی نادیارە، بەوەی خۆی لە مرۆڤ بە دوور دەگرێ سووکایەتی بە مرۆڤ دەکات، خۆی بە قۆزاغەیەکی نهێنیی دەورە داوە، کە پەیپێنابرێ. لە هەوڵە شێلگیرەکانی (ك.)دا بۆ ڕۆچوون بەو پەنهانییەدا، بێمانایی ئەو هەوڵانەی و ئەو سووکایەتییەی بۆ دەردەکەوێ کە پابەندین.

ناڕازیبوونی مرۆڤ بە جیهانی ژیانی مۆدێرنەوە، نامۆبوونی «کە پێی ڕاهاتووین»، بە بەسەرەوەنان و گەیاندنە چڵەپۆپەی لە لایەن کافکاوە جارێکی تر دیاری خستەوە.

کافکا بە هیچ جۆرێك تاقە دەسەڵاتێکی توندوتیژ نمایش ناکات، بەڵکو چڵوپۆپە وردەکانی، کە ئێمە ـ بە بێ ئەوەی هەستی پێبکەین ـ ڕۆژانە ملکەچیان دەبین.

(ك.) لە هەر شوێنێك بێت لەوێدا لەبەردەم دادگادایە. کاتێ دەچێتە سەر جادە لە پەنجەرەکانەوە پێی پێدەکەنن، کاتێ لە نووسینگەکەی دادەنیشێ و بیر لە دادگاییەکەی دەکاتەوە، یارمەتیدەری بەڕێوەبەر بە پێکەنینەوە خۆی بە ژووردا دەکات، کاتێ ئێوارێ بۆ ماڵەوە دەگەڕێتەوە لەو بڕوایەدایە پاسەوانێك لە بەردەم خانووەکەدا دەبینێ! سەرجەمی بیرکردنەوەی هەوڵێکی بەردەوامە بۆ سەلماندنی کەسایەتی خۆی؛ ئەو کارانەی دەکرێ، خۆکرد پووچەڵکردنەوەی هەوڵەکانین. یوسف (ك.) دەستبەرداری ئەوە دەبێ، درێژە بە بانگەشەکانی بدات، لە بەر ئەوەی دەبینێ، هەموو بانگەشەیەکی نسکۆیەکی بە دوادا دێت. لەم گەمەیە ماندوو بووە، بڕستی لێبڕاوە، نایەوێ گەمژە و کاڵفام بێت و لە خۆی دەپرسێ: «ئایا دەبێ پێم پیووترێ، من لە سەرەتاوە ویستم کۆتایی بە دادگاییەکە بهێنم و ئێستاش لە کۆتاییدا، جارێکی تر دەمەوێ تێهەڵچمەوە؟». ئەگەر بیەوێ دەتوانێ لە دادگایی بەردەوام بێت. لە داگاوە بە تۆپزیی کۆتایی بە دادگایی نەهاتووە.

ئێمە دەزانین لۆژیك تۆکمەیە و دەستکاری ناکرێ، بەڵام لە بەردەم مرۆڤێکدا کە ویستی ژیانی هەیە لۆژیك خۆی ڕاناگرێ، ئەو لۆژیکەی کە ناتوانرێ دادگاییەکە کۆتایی پێبهێنرێ، کە هەموو بانگەشەیەکی بوون پووچەڵبوونەوەی بە دوادا دێت، ڕاستە ئەم لۆژیکە لە گەڵ ئەوەشدا نەگۆڕە، بەڵام ویستی مرۆڤێك بۆ ژیان تا ئەو ڕادەیە ئەم لۆژیکە دەسمێ، کە لەگەڵ بێ ئاسۆییدا ئەم ژیانە دەژی و لە گەڵ چەندان بار پووچەڵبوونەوەیدا بانگەشەی بوونی خۆی دەکات. یوسف (ك.) دەستبەردار نابێ، بانگەشەکانی درێژە پێبدا، لە بەر ئەوەی دەبینێ هەموو بانگەشەیەك پووچەڵ دەکرێتەوە. لەم گەمەیە ماندوو بووە. ئەمانە هێشتا بەرهەڵستین، ئەمانە هێشتا بانگەشەی بوونن، کە (ك.) هێشتا کردوونی، بەڵام هێزی نەماوە، بڕستی لێبڕاوە، ویستی نەماوە، لەوە زیاتر خۆی بسەلمێنێ، لە بەر ئەوە خۆویستانە ملی خۆی دەخاتە ژێر چەقۆ. ئەم کۆتاییە خۆویستانەیە و پێویست نییە. بەڵام ئەمەش بۆ ئێمەی خوێنەر شتێکی نوێ نییە. (ك.) بە درێژایی ڕۆمانەکە هەمیشە بە زیانی خۆی مامەڵە دەکات. بەڵام دەبێ لە خۆمان بپرسین: ئایا بڕستلێبڕانی پاڵەوانەکە، ماندووبوون لە گەمە، وەکو ڤاڵسەر



دەڵێن، هۆکاری کۆتایی ژیانی (ك.)ن

بە لای کەمەوە یوسف (ك.) بە جۆرێکی تر لێی تێدەگا. ئەو بە کۆتایی وزەی تێناگا، بەڵکو بە کۆتایی دادگاییەکەی تێدەگا.

لێرەدا جێی خۆیەتی لە کۆتاییدا ئەو پرسیارە بکەین کە یەکەم ڕستەی ڕۆمانەکەیە:

پرسیاری ‹گوناه› یان ‹تاوان› بمانەوێ یان نەمانەوێ خۆیمان بەسەردا دەسەپێنێ، کە (ك.) لە سەرەتای ڕۆمانەکەدا دەستبەسەر دەکرێ، چونکە ئەوەندەی ئێمە تێبگەین، یەکێك دەگیرێ ئەگەر تاوانێکی کردبێ، ئەو کەسە تۆمەتبارە کە بە پێی نۆرمەکان هەڵس و کەوتی نەکردبێ. دەدرێ بە دادگا و لەوێ دەبێ تاوانەکەی بسەلمێنرێ، شکاتی لێدەکرێ و دەتوانێ بەرگری لە خۆی بکات. کە تاوانەکە سەلمینرا، حوکمی بە سەردا دەدرێ و سزای خۆی وەردەگرێ. ئەمە تێگەیشتنی ئاساییە بۆ دەستبەرسەرکردن، دادگا، تاوان، سزا هتد. بەڵام ئەم وێنایەی دەستبەرسەرکردن، دادگا، تاوان، سزا هتد هەمیشە لە واقیعی ڕۆمانەکە لادەدا، بە جۆرێك خوێنەر لە کاتی خوێندنەوەی ڕۆمانەکەدا ـ کافکا بە وردیی حیسابی بۆ ئەم جۆرەی خوێندنەوە کردووە ـ خۆکرد ئەم پرسیارانە دەکا: ئەمە چۆن دادگایەکە؟ (ك.) دەبێ چ تاوانێکی کردبێ؟ ئایا لە بەرامبەر دادگادا دروست ڕەفتار دەکا؟ کوشتنەکەی لە کۆتایی ڕۆمانەکەدا چۆن لە گەڵ ئەو تاوانەدا یەك دێتەوە کە هەرگیز ناوزەد ناکرێ و پاڵەوانەکە قبووڵی دەکات؟

لە سەرەتادا (ك.) دەستگیرکردنەکەی، تاوانەکەی و بڕیاری دادگا بە ڕبەی ژیانی ڕۆژانەی دنیایی دەپێوێ. وەکو بازرگانیی سەیری دادگاییەکە دەکا. لەم پێگەیەوە بەرهەڵستی دادگا دەکا و هەموو تاوانێك لە خۆی بە دوور دەگرێ. بۆ (ك.) تاوانباربوون بۆ مرۆڤ ڕێزپەڕییە، بەڵام ڕەنگ بێ بە تەواوی بەراوەژوو ببێتەوە، واتە ئاساییە، کە مرۆڤێك، هەر مرۆڤێك بێت، تاوانبار بێت. لەوانەیە نەتوانرێ تاوان بسەلمێنرێ، چونکە لە هەموو شوێنێك ئامادەیە. دەستەواژەی تاوان یان گوناه دەبێتە گوزارشت لە بوون یان بوون خۆی و هاوواتایە لە گەڵ دەستەواژەی مرۆڤ.

چەمکی گوناه لە ڕۆمانەکەدا بە مانای جیاواز بەکاردەهێنرێ. ئەوەی من پێ بزانم هەتا ئێستا زۆر لە بارەی کافکا و نووسینی کافکا لە ئەدەبی ئێمەدا مشتومڕ نەکراوە، پاش وەرگێڕانی دادگایی لە لایەن عەتا نەهایی و بڵاوکردنەوەی لە لایەن دەزگای چاپ و پەخشی سەردەمەوە بە هیوا بووم ڕۆشنبیرانی کورد ڕاهێنان بۆ ئەم ڕۆمانە و بەرهەمەکانی تری بکەن، بەڵام وا خەریکە ئەم بەرهەمە

دانسقەیەش کۆن دەبێ بە بێ ئەوەی شەنوکەوێکی بۆ بکرێ یان لە گەڵ ئەو کەشە سەردەستەی ژیان سیاسەتی ئێمە بەراورد بکرێ، یان هەندێ ئاماژە و هێڵی هاوبەش لە نێوان ئەم ڕۆمانە و ‹لە خەوما›ی جەمیل سائیب بدۆزرێتەوە. بەوە دەچێ ئەو لێشاوە وەرگێڕانەی ئەمڕۆ لە ئەدەبی کوردیدا دەکرێ نووسەر و ڕەخنەگرانی کورد لە خەوی خۆشیان بێدار نەکەنەوە و نەبنە مایەی خوێندنەوەیەك.




سەرچاوەکان:


Franz Kafka, Der Prozess, Frankfurt am Main 1994

,Ritchie Robertson, in Michael Mller, Franz Kafka, Romane und Erzhlungen, Reclam

,Stuttgart

.Michael Mller, Franz Kafka, der Proze, Reclam, Stuttgart, 2003

Volker Kreischel, Franz Kafka, der Prozess, Bange, Hollfeld, 2011

**له‌ چ ئێستایه‌كدا ده‌ژین؟**
**كایه‌ی كتێب: كۆمه‌ڵه‌ وتار**
**نوسینی: مه‌ریوان وریا قانیع**
**دیزاینی به‌رگ: باسم ڕه‌سام**
**بڵاوكه‌ره‌وه‌: ناوه‌ندی ڕۆشنبیری و هونه‌ری ئه‌ندێشه‌**

ئه‌وه‌ی خوێنه‌ر لێره‌دا ده‌یخوێنێته‌وه‌ سێ لێكۆڵینه‌وه‌ی درێژه‌ ده‌رباره‌ی دۆخی ئێستای كۆمه‌ڵگای ئێمه‌ و دۆخی ئێستای دراوسێ گه‌وره‌كانمان له‌ ناوچه‌كه‌دا. ئه‌و ئێستایه‌ش كه‌ ئه‌م كتێبه‌ قسه‌ی له‌سه‌رده‌كات هه‌م «ئێستایه‌كی مێژووییه‌»، واته‌ ئه‌و هه‌لومه‌رجه‌ كۆمه‌ڵایه‌تی وسیاسی و فه‌رهه‌نگیه‌ مێژووییه‌یه‌ كه‌ له‌ ئێستادا ئاماده‌یه‌، بێگومان به‌ سه‌رجه‌م ئه‌و بكه‌رانه‌وه‌ كه‌ له‌و ئێستایه‌دا ئاماده‌و ده‌ست به‌كارن. هه‌م ئه‌و «ئێستایه‌» ئێستایه‌كی تیۆرییه‌»، واته‌ ئێستایه‌ك وه‌ك كێشه‌یه‌كی فیكری، وه‌ كۆمه‌ڵێك پرسیاری تیبوری و مه‌عریفی و وه‌ك كۆمه‌ڵێك چه‌مك و میتۆدی بینین و ڕافه‌كردنیش هه‌رسێ نوسینه‌كه‌ی ناو ئه‌م كتێبه‌ له‌ نێوان ئه‌م دوو ئاسته‌ جیاوازه‌ی مامه‌ڵه‌ كردنی ئێستادا دێن و ده‌چن، چه‌ند قسه‌ له‌ مێژوو ده‌كات، ئه‌وه‌نده‌ش هێما بۆ فیكرێكی تیۆری دهكات كه‌ ئه‌و مێژووه‌ ده‌گۆڕێت بۆ كۆمه‌ڵێك چه‌مك و وێنه‌ و پێدراوی فیكری.

له‌كوردستانی ئه‌مڕۆدا به‌رخۆریی بووه‌ به‌دیارده‌یه‌كی جه‌ماوه‌ری به‌رفراوان و له‌وه‌ كه‌وتووه‌ ئاكاری ئه‌م یان ئه‌و گروپی تایبه‌تی ناو ئه‌و كۆمه‌ڵگایه‌ بێت به‌ته‌نها. هه‌م چینه‌كانی خواره‌وه‌ و هه‌م چینی ناوه‌ڕاست و هه‌م نوخبه‌ی ده‌سه‌ڵاتدار و ده‌وڵه‌مه‌نده‌ی به‌ شێوه‌یه‌كی ئه‌فسانه‌یی له‌ ساڵانی رابردوودا ده‌وڵه‌مه‌ند بووه‌، هه‌موویان به‌شێكن له‌و شه‌پۆلی به‌رخۆرییه‌ی له‌ وڵاته‌كه‌دا دروست بووه‌. ئه‌م به‌رخۆرییه‌ رووی له‌هه‌موو ئاراسته‌كانه‌، وه‌ك چۆن به‌رخۆریی رووبه‌رێكی گه‌وره‌یی له‌ چالاكییه‌ دونیایی و عه‌لمانییه‌كانی ئینسانی ئێمه‌ی گرتۆته‌وه‌، به‌هه‌مان شێوه‌ چالاكییه‌ دینییه‌كانی دونیای ئێمه‌ش رووكارێكی به‌هێزی به‌رخۆرییان وه‌رگرتووه‌.





# گەشتەکەی ئانا کارێنینا

## لە مۆسکۆوە بۆ ریگا

دانا رەئوف

ماوەیەك بوو لە مۆسکۆ دەژیام، ئەوە یەکەمجار بوو سەفەر [illegible] بۆ دەرەوەی سنووری ولاتەکەی خۆم بکەم، هەر لەوێشەوە چووم بۆ شاری ریگا، [illegible] تا دەرباز بم و وەك پەناهەندەیەك خۆم بگەیەنمە ئەوروپا.

هێندە لە مۆسکۆ مابوومەوە بە ئاسانی هەموو شوێنێکم دەدۆزییەوە، بە تایبەتی

شانۆکان که بەسەر شەقام و کۆڵان و پانتاییەکانی شاری مۆسکۆ دا بڵاوبوونەتەوە و ژمارەیان ئێجگار زۆرە.
یەکێك لە شەوە ساردەکانی مانگی دوازدە بلیتێکی شانۆی «مخات» دەکرِم و دەچمە ژوورەوە، لەناو ڕووسەکاندا و لە یەکێك لە ریزەکانی پێشەوەی شانۆکەدا، بە تامەزرۆییەوە لە شوێنەکەی خۆم دادەنیشم. شانۆی «مخات» شانۆ کۆنەکەی ستانیسلاڤیسکییە و ئەم شەو لە هەوڵێکی هونەریدا رۆمانە گەورەکەی تۆڵستۆی١٨٢٨ـ١٩١٠ «ئانا کارێنینا» بۆ شانۆ ئامادەکراوە و بەپێی ترادیشون و رێبازەکەی ستانیسلاڤیسکی نمایش دەکرێت.
نەمایشەکە بەپێی رۆمانەکە و بە شێوەیەکی وردەکاری بەرجەستەی واقیعێکی ئەرستۆکراتی و کۆمەڵگەی رووسی لە سەدەکانی هەژدەدا دەکات و ئەکتەرەکان بە ریتمێکی خاو و ناخۆش و بێزارکەرەوە ڕووداوەکانی رۆمانەکە دەکەنە شانۆنامەیەکی تەقلیدی و وەك فیلمێکی رەش و سپی پێشکەشی دەکەن.
هیچ تێناگەم، رۆمانەکەشم لەوەوبەر نەخوێندۆتەوە و کارەکتەرەکان ناناسمەوە، کچە جوان و جلوبەرگە قەشەنگ و گرانبەهاکانی بەریان، بۆ من و لەم نمایشەدا وەك تارماییەکی نادیار وان.
هەندێك لە زمانی رووسی فێربووم، دەتوانم رستەی کورت، وشە و دەستەواژەی رووسی بەکاربهێنم و کە قسەش دەکەن لێیان تێدەگەم، بەڵام هیچیان لەم نەمایشەدا ناناسمەوە و هەموو زمانەکە، مۆسیقای دەنگەکان و ئاخافتنی ئەکتەرەکان بە گوێی من نائاشنان و تێیان ناگەم. خودی شانۆنامەکەش هیچ چێژێکم پێنابەخشێت.
ئانا کارێنینا لەم ساتەدا لەسەر زۆربەی شانۆی شار و هەرێم و ناوچە جیاوازەکانی رووسیادا نەمایش دەکرێت، ئەفیشی ئەم نەمایشانە و ئانا کارێنینا بە قەد دیوار و رووکاری شانۆکان و لەسەر رووپەڕی رۆژنامەکاندا بڵاوبوونەتەوە و لەوە دەچێت هەموو رووسیا وەك عاشقێکی ناکام و دڵشکاو بە دوای ئانا کارێنینا و عەشقێکی بزربوودا بگەڕێن.






## ریگا/ ١٩٩٢

شەوێکی تاریکی زستان، بە پاسێکی پڕ لە پەناهەندە و خێزانی رووسی، بە ترس و دڵەخورپێ

و چاوەڕوانی و هیوایەکی زۆرەوە، لە مۆسکۆوە دەڕۆم بۆ شاری ریگا.
هەموو شەوەکە نائارام، لە پەنجەرەکانی پاسەکەوە تەماشای تاریکییە رەشەکەی دەرەوە دەکەم، وەك ئەوەی لە پشتەوە، لە ناو تاریکییەکەدا نهێنییەك خۆی حەشاردابێت و منیش بمەوێت ئەو نهێنییەم بۆ دەرکەوێت. جار جارە رووناکییەکی کزی ئۆتۆمۆبیلێکی تیژڕۆی تر کە بە پێچەوانەی ئاراستەی ئێمە و لەوبەری جادەکەوە دەڕوات، بۆ ساتێك ئەو تاریکییە ئەنگوستەچاوە دەبڕێت.
لەگەڵ کازیوەی بەرەبەیان دەگەینە سنوور و پاسەکەمان رادەگرن، سەیری پاسپۆرتە تەزویرکراوەکانمان دەکەن و بە بزەیەکی گاڵتەئامێزەوە لێمان دەڕوانن.
بە جوڵانەوەیەکی خێرا، وەك ئەوەی لە خەونێکی خۆش بەئاگایان هێنابمەوە، تەماشایەکی چواردەوری خۆمان دەکەم و بەبێ بیرکردنەوە و بە شێوەیەکی خۆکردە پەنجا دۆلارێك لە گیرفانم دەردێنم و دەیخەمە دەستی سەربازە سورفلەکەی بەردەمم.
بەبێ دوودڵی و بە خێرایی دۆلارەکەم لێ وەردەگرێت، بە سیمایەکی مردووەوە سەیرێکم دەکات، تاوێك بەبێ ئەوەی چاو بتروکێنێت لێم ورد دەبێتەوە و پاشان



پاسپۆرتەکەم ئەداتەوە دەست و ئاماژەیەکی پاسەکە دەکات.
خێرا و بەرلەوەی پەشیمان بێتەوە یان سەربازەکانی تر بەم دیمەنە شانۆییە بزانن، دەچمەوە پاسەکە و لەسەر جێگەکەی خۆم دادەنیشم، هەست دەکەم جەستەم بچوك بۆتەوە و دەمەوێت تا زووە شۆفێرەکە بڕوات. دەگەینە ریگا و لە تەرمیناڵی پاسەکان دادەبەزم، جانتاکەم ئەدەمەوە بە شانمدا و بەبێ هیچ پلانێك چەند هەنگاوێك دەچمە پێشەوە، دەچمە ناو تەرمیناڵەکەوە و یەکەم شت کە چاوم دەکەوێتە سەری، ئەفیشێکی گەورەی شانۆنامەی «ئانا کارێنینا»یە، وەك ئەوەی ئانا کارێنینا لە چاوەڕوانی ئێمەدا بێت تا پێکەوە بۆ کەنارێکی نادیار و ئارام هەڵبێین.

**بیست ساڵ دواتر**
**گەڕانەوە بۆ ریگا/ ٢٠١١**

بە پێچەوانەی بیست ساڵ لەمەوبەرەوە، لە فڕۆکەخانەیەکی گەورە و مۆدێرنەوە دێمە دەرەوە، هەمان کات و هەمان کەش و هەوا و هەمان «من» بەڵام لە بارودۆخێکی تردا، بە هەنگاوی دڵنیاوە دەچمە ئەو تەکسییەوە کە دەمگەیەنێتە

ئوتێلەکەم.

شاری ریگای پایتەختی لێتلاند دادەنرێت بە گەورەترین ولآتانی باڵتیك و لە ناوەڕاستی شارەکەدا، شارێکی دێرین وەك شانەیەکی گرنگی ئەم شارە، لە سەردەمە دێرینەکانی چاخی ناوەڕاستەوە، بە شێوە ئۆرگیناڵییەکەی خۆی ماوەتەوە «١».

شارەکە بریتییە لە کۆمەڵێك کڵێسای کۆن، خانووبەرەی سەردەمە جیاوازەکان، پردی بچووك کە هەندێ لە گەڕەکەکانی ئەم شارە پێکەوە دەبەستێتەوە. ریگا و ئەم شارە دێرینەی ناوجەرگەی شار تەنها لە ڕووی خانووبەرە و کۆڵانە باریك و تەسکەکانییەوە، سیما و بنەماکانی چاخەکانی ناوەڕاستی نەپاراستووە، بەڵکو ئەو ئەتمۆسفێرە گەرم و ئاهەنگئامێز و پشێوییەی سەردەمە دێرینەکانی پێوە دیارە، لە هەمانکاتدا بووەتە شارێکی مۆدێرن، بەشێك لە ئەوروپای یەکگرتوو و کۆسمۆپۆلیتیك «٢».




بە یەکێك لە کۆڵانەکاندا دەڕۆم، لە دوورەوە گوێم لە ناڵی ئەسپە کە بەسەر رێگە بەردینەکەدا، بەپێی ریتمێکی سەربازی دەڕوات، گوێ رادەگرم و چاوم دەنووقێنم، وا دەزانم گەڕاومەتەوە چاخەکانی ناوەڕاست. کە لە سەری یەکێك لە کۆڵانەکانەوە دەچمە دەرەوە، دەکەومە نێو هاتوهاواری ئەو خەڵکە زۆرەی کە لە گۆڕەپانەکەی بەردەم یەکێك لە کڵێسا کۆنەکاندا دێن و دەچن. هەر لەم گۆڕەپانەدا هونەرمەندی گەڕۆك، سێرکەوان، گۆرانیبێژ و مۆسیقاری سەرشەقامەکان چەندین نمایشیان خولقاندووە و خەڵکیان لە دەوری خۆیان کۆکردۆتەوە «٣».



لەم ناوچە دێرینەی شاری ریگادا چەندین کڵێسای گەورە، بە تاوەری بەرز و رازاوەوە بەرزبوونەتەوە، لە هەموو کۆڵان و ناوچە و گۆڕەپانێکدا کڵێسایەك هەیە و مێژووی دروستکردنی هەندێکیان دەگەڕێنەوە بۆ سەرەتای سەدەی سیازدەیەم و نوێترینیان لە سەدەی هەژدەیەمدا دروستکراوە و ئەمەش بە ڕوونی قۆناغەکانی هونەری خانووبەرەمان بۆ دەستنیشان دەکات. هەروەها ئەم کڵێسایانە هێماگەلی دەسەڵاتی ئەم شوێنانەن وەك ناوەندێکی گەورەی ئایینی و سیاسی، دووپاتی ئەوەش دەکاتەوە کە پیاوە ئایینییەکان لەم شوێنانەوە دەسەڵاتی رەهای سیاسی/ ئایینی خۆیان پیادەکردووە.

ریگا هەر بە کڵێسا دێرینەکانی بەناوبانگ نییە، بەڵکو ئەم شارە یەکێکە لەو شارە دەگمەنانەی کە چەندین خانووبەرە و کۆشکی دێرینی سەردەم و سەدە جیاوازەکانی تیایە و بوونەتە سیمایەکی

شارستانی و ئاوەدانی «٤».
 بەناو حەشاماتەکەدا دەڕۆم، دەچمە کۆڵانەکەی ئەوسەرەوە و بەرەو خوار دەبمەوە، لەپڕ لە سەری ئەوسەری کۆڵانەکەوە دێمە دەرەوە بۆ ناو گۆڕەپانێکی بچوکتر و خۆم لەبەردەم خانووبەرەیەکی ئێجگار جواندا دەبینمەوە. ئەم کۆشکە کە لەلای راستەوە بە ڕووی دەریا گەورەکەی ئەم شارەدا بەرزبۆتەوە، بە ماڵی سەر ڕەشەکان ناوزەد کراوە و لە ساڵی ١٣٣٤ دا رۆنراوە. ئەم شوێنە بۆ بەزم و کەیفی بازرگانە ئەڵمانەکان تەرخانکراوە و ئەو ئاهەنگانەی لەم کۆشکەدا گێڕدراوە، شێوەیەکی رەمەکی و کێوی لەخۆ گرتووە و هەموو جۆرە بەربەستە دەروونی و کۆمەڵایەتی و کەسایەتییەکانی بڕیوە و شەو و رۆژ لەنێو قاقای پێکەنین، بادەنۆشی، سەما، جووت بوون و رشانەوەدا بزربوون٥.
 دەچمە ئەو هۆڵە گەورەیەوە کە سەردەمانێك شانۆی ئاهەنگە کێوییەکان بووە، هەر لەم هۆڵەدا پێشوازی لە میوانەکان؛ سەرکردە سەربازییەکان، سیاسەتمەداران، بازرگان و هونەرمەندان کراوە، ریشارد ڤاگنەر و فرانس لیزیت چەندین جار سەردانی ئەم خانووبەرەیان کردووە و لەم هۆڵەدا کارە هونەرییەکانیان پێشکەش کردووە.
لەژێرزەمینە تاریك و شێدارەکەی ئەم کۆشکەدا، کۆمەڵگەیەکی سەدە دێرینەکانی مێژوویان بە هەموو وردەکارییەکانییەوە و بە شێوەیەکی مینیاتری دروستکردووە. کە



بە پێپلیکانەکەدا دەڕۆمە خوارەوە وا هەست دەکەم هەموو خانووبەرەکە هەناسە دەدات، هەست دەکەم هەناسەم تەنگ دەبێت و لەگەڵ ئاهەنگگێڕەکانی ئەو سەردەمە دێرینانەدا هەناسە ئەدەم، هەناسە بۆ ئەوان ئەدەم و ئەوانیش لە تاریکییەکەوە، لەنێو پەنا و پەسار و لە ژێرزەمینەکەوە، لەو شوێنانەی کە نابینرێن، چاوە زەقە سوورهەڵگەڕاوەکانیان تێبڕیوم، دەمیان نوقاوە و بە بێدەنگیی هاوار دەکەن.
 دیوارەکان دەلەقێن، ئەرزەکە جیرە جیڕی دێت و مرۆڤی پیر و پەککەوتە بە ددانی رزیو و پیسەوە، وەك ئەوەی کەفی لالغاوە و مەرگی سەر روخساریان نەسڕیبێت دەردەکەون.
بۆنی گڵ و شێداری و کەڕو دەمباتەوە بۆ سەردەمانێکی دێرین، بۆ بیست ساڵ لەمەوبەر، بۆ ئەو رۆژەی لێرەوە، لە ریگاوە بە ترس و دڵێکی پڕ لە هیواوە دەرباز بووم.
 بە شێوەیەکی بازنەیی دەڕۆم و دوای بەسەرکردنەوەیەکی ئەو کۆمەڵگەیە، دەگەمەوە لای پێپلیکانەکان، بە خێرایی و بەرلەوەی هەوا شێدارەکە، بۆنی barووت و دیمەنی کەفی لادەمی مردووەکان هەناسەم لێ ببڕن، سەردەکەومە سەرەوە.

تیشکی ڕۆژەکەی دەرەوە لە پەنجەرەکانەوە هاتۆتە ژوورەوە و فیگوری جیاوازیان لەسەر دیوار و ئەرزەکە دروستکردووە و کەشێکی ئارام و ژوورێکی گەرم و بێدەنگ باوەشم بۆ دەکاتەوە.

**سەرلەنوێ ئانا کارێنینا**

**نمایشێکی نوێی ئانا کارێنینا لە ریگا**




لەم چەند ساڵەی دواییدا ڕۆمانە کلاسیکییە بەناوبانگەکەی نووسەری ڕووسی تۆڵستۆی «ئانا کارێنینا» کە لە ساڵەکانی سەدەی هەژدەدا نووسراوە، بە شێوازێکی مۆدێرن و لە دیدێکی دراماتۆرگی تۆکمەدا بە شانۆکراوە و لەسەر زۆربەی شانۆ گرنگەکانی ئەوروپا بە بەردەوامی نمایش دەکرێت. لە ستۆکهۆڵم، لە بەرلین، لە مۆسکۆ و ئێستاش لەسەر شانۆی نەتەوایەتی ریگا «٦».



ئانا کارێنینا چیرۆکێکی خۆشەویستی، پەیمان، پەیوەندی هاوسەرگیری، خیانەت، بێوەفایی، ئیرەیی، دڵپیسی، مەرگ، کۆمەڵگە و کۆمەڵگەیەکی ئەرستۆکراتی دەخاتە نێو کێشەیەکی ئاکاری و کەسایەتییەکان ڕووبەڕووی هەڵبژاردن، یاخیبوون، چارەنووس و ئاکامەکانیان دەکاتەوە.

ئانا کارێنینا ژنێکی شۆخە، بڕوایەکی پتەوی بە کەسایەتی خۆی هەیە، بە سەربەستی لە پانتاییە کۆمەڵایەتییەکاندا دەجوڵێتەوە و پێگەیەکی کۆمەڵایەتی گرنگی هەیە، لەگەڵ ئەوەشدا کە هەست بە بێزاری و ناخۆشی ژیانی هاوسەرگیری خۆی و تاکرەوی مێردەکەی «ئەلێکسی کارێنینا» دەکات، بەڵام هەست بە بەختیارییەکی درۆزنانە دەکات و قایلە بەو ژیانەی خۆی.

ئانا کارێنینا لە یەکێك لە ئاهەنگی سەما کردنەکانیاندا لەگەڵ «ئەلێکسی فرۆنسکی» کە ئەفسەرێکی پلەبەرز و خاوەن دەسەڵاتە، سەما دەکات، ئەو سەمایە دەبێتە دەسپێکی خۆشەویستی و تەنگژەیەکی دەروونی و گێژاوێکی ئاکاری. ئانا کارێنینا لە تاریکییەکانی هەست و سۆزدا بزر دەبێ و هەموو ڕۆمانەکەش، وەك بەرئەنجامێکی ئەو عەشقە بە مەرگی ئانا کارێنینا کۆتایی پێدێت.

ئانا کارێنینا دەکەوێتە ناو عەشقێکی گەورەوە، هەموو ژیانی خێزانی و منداڵەکەی و بەختیاریی و پلەوپایەی خۆی و هاوسەرەکەی وەلا دەنێت و بۆ ئەو خۆشەویستییە دەژی، ئانا کارێنینا لە فرۆنسکی-

دا ئەو ژیانە رۆمانسییە دەبینێت کە خەونیان پێوە دەبینێت. ئانا کارێنینا لە گەڕان بەدوای بە ختیاریی و عەشقێکی رەهادا ناچار دەبێت لە نێوان خۆشەویستی و جگەرگۆشەکەیدا فرۆنسکی هەڵبژێرێت، بەمەش نەك تەنها دڵیشی و رۆحیشی لەدەست ئەدات، بەڵکو بە دەستبەرداربوونی مێردەکەی و جگەرگۆشەکەی هیچ بەختیارییەك، هیچ عەشقێکی رەهاش لەگەڵ فرۆنسکیدا نادۆزێتەوە.

تۆڵستۆی رۆمانەکەی بەم وتەیە پێشکەش دەکات «هەموو خێزانە بەختیارەکان لەیەك ئەچن، بەڵام خێزانە بەدبەخت و چارەڕەشەکان هەریەکە بە شێوەیەك بەدبەخت و چارەڕەشن. «٧»

تۆڵستۆی بە چوار ساڵ رۆمانی «ئانا کارێنینا»ی نووسیوە، جاری وا هەبووە بە چەندین مانگ نەچووەتەوە سەری و هەر بیری لێکردۆتەوە، لەیەکێك لە یاداشتەکانیدا نووسیویەتی: «سەر لە نوێ خەریکی نووسینی ئانا کارێنینام، کە بێزارکار و دوورودرێژ و رۆژانەیە، لە خوا دەپاڕێمەوە هێز و وزەم پێ ببەخشێت تا بە زووترین کات بتوانم تەواوی بکەم . . . خۆزگە کەسێکی تر لە بری من هەبووایە تا ئانا کارێنینای بنووسیایە«.

گەر ئانا کارێنینا لەسەر شانۆی مەکسیم گۆرکی لە بەرلین چەمکێکی ئەزموونکاری و ئەڤانگاری لەخۆگرتبێت، ئەوە لە مۆسکۆ دەبێتە ریالیزم و وێنەیەکی دەقاودەقی سەدەی هەژدەمان بۆ بەرجەستە دەکات، لە ئۆپسالای سوێد زیاتر دەبێتە شێوازێکی تجریدی و فۆرمێکی ساکار پەیوەندییە ئەڤینداریيە بەهێزەکەی ئانا کارێنینا و پەیوەندییە کۆمەڵایەتییە ئاڵۆزەکان و کۆمەڵگا ئەرستۆکراتییەکان بە ساکاریی، بەڵام بە تێگەیشتنێکی قووڵەوە بەرجەستە دەکات.

ریژیسۆری لێتلاندی میخایل گرۆزدۆن لەسەر شانۆی نەتەوایەتی لێتلاند پارسەنگێکی هونەری لەنێوان چەندین شێوازدا دەدۆزێتەوە و زیاتر دیقەت دەخاتە سەر هونەری نواندن و داماڵینی توێژاڵە یەك لەدوای یەکەکان، بەم شێوەیەش شانە گرنگ و سەرەکییەکەی رۆمانەکە، لە زەمەنێکی تر و بە شێوازێکی مۆدێرن ئەدۆزێتەوە. ئەم ریژیسۆرە دووپاتی ئەوە دەکاتەوە کە چۆن شانۆ دەتوانێت گوێ لە کتێبێك بگرێت و ژیانێکی تازەی پێببەخشێت «٨».

**نمایشەکە**

سێ دەرگا بە تەنیشت یەکترەوە، لە قووڵاییە بەتاڵەکەی شانۆکەدا و بەرامبەر بە بینەران دانراوە، کارەکتەرە سەرەکییەکان لە دەرگاکانی لای راست و چەپەوە دێنە دەرەوە، دەچنە ژوورەوە و هەندێك



جار کارەکتەرەکانی تر لە پشتەوە، لە دالآنە تاریکەکانەوە دەبینرێن، بە خێرایی دەڕۆن و هەر بە خێراییش لەچاو ون دەبن، جاری واش هەیە کارەکتەرەکان بەر لە هاتنە ژوورەوەیان، لە دەرگاکانەوە دەردەکەون و وەك چاودێرێك سەیری رووداوەکان دەکەن.

گۆڕانکاری دیمەنەکان خێرایە، لەچاوتروکانێکدا شانۆکە دەبێتە هۆڵی کۆشکی بنەماڵەیەکی ئەرستۆکراتی و لە هەموو دەرگاکانەوە، کەسایەتییەکان دێنە سەر شانۆ، تێکەلآوی یەکتر دەبن، سەمایەکی تەقلیدی، بەلآم بە شێوازێکی نوێ دەکەن و دەروازەیەکی مۆدێرن بۆ رووداوەکان دەکەنەوە و ئاهەنگێکی سەما و ریتمئاسا پەیوەندییەکانی ئانا کارێنینا لە جوڵەیەکی بازنەییەوە بە کارەکتەرەکانی تر و بە رووداوەکانیشەوە دەبەستێتەوە.




هەر لەم ئاهەنگەدا و بە جوڵەیەکی تری تیژ، ئانا کارێنینا ئاراستەکانی سەماکە دەبڕێت و لە بارودۆخێکی ناراستەوخۆدا، دەسپێکی پەیوەندییەکانی، هەڵوێستە جیاوازەکەی و رووکارە پێچەوانەکەی ئاشکرا دەکات.



ریژیسۆری شانۆنامەکە کارەکتەرە سەربازەکان، بە کورسی وەك هیماگەلی دەسەلآتی سەربازی، لە دیدی چەند جولآنەوەیەکی دیسپلین ئاسا و خێراوە بەکاردەهێنێت: بۆ نموونە دەبنە دەروازەی هەندێك لە رووداوەکانی دوای خۆیان، هەر ئەو کورسیانە دواتر دەبنە وێنەی شانۆیی و بە چەندین فۆرم و شێوازی هێماگەلی جیاواز، گوزارشت لە پێگەی ئانا کارێنینا و ئەلێکسی فرۆنسکی دەکەن. کورسییەکان دەبنە گەمەیەکی ئێستاتیکی و لەهەمانکاتدا ئامرازێکی گوزارشتئامێز و هێماگەلێکی بەردەوام و ریژیسۆر دەیانکاتە هێڵێکی کاریگەر و لە سەرەتاوە تا کۆتایی بە شێوازی جیاواز دەبینرێن و دیمەن و رووداوەکان بە یەکەوە دەبەستنەوە.

نمایشەکە بە دیمەنێکی ئێستاتیکی و تابلۆیەکی شانۆیی بەرجەستەی پەیوەندییە سێکسییەکەی نێوان ئانا کارێنینا و ئەلێکسی فرۆنسکی دەکات: ئانا کارێنینا لەسەر کورسییەك قاچی درێژ کردووە بۆ فرۆنسکی کە لەسەر چۆك لەبەردەمیدا دانیشتووە، فرۆنسکی هێدی هێدی بە جولآنەوەیەکی سەمائاسا قەیتانی پووتە درێژەکەی ئانا کارێنینا دەکاتەوە، ئانا کارێنینا لەگەڵ راکێشانی گرێی هەر قەیتانێکدا، چێژی جووت بوون و چوونە ناوەوەی یەکتریان بۆ دەخوڵقێنێ. دیمەنەکە دەگاتە ترۆپك کە ئانا کارێنینا دوای داکەندنی پووتەکانی بە تەنها و بە جەستەکی پڕ لە حەز و شەهوەت و مووچڕکەی جووت بوون و

ئۆرگازمەوە بەرەو دەرگاکەی ناوەڕاست، بە کۆمەڵێ جووڵەی تێکشکاوەوە دەڕوات.

لە دیمەنێکی راستەوخۆدا و لە چارەسەرێکی دراماتۆرگییانەی شیکاریدا، ریژیسۆر پێنج لە کەسایەتییە سەرەکییەکان، بۆ نموونە ئانا کارێنینا، ئەلێکسی کارێنینا «مێردەکەی»، ئەلێکسی فرۆنسکی... بەرامبەر بە بینەران و لە پێشەوەی بەردەمی شانۆکەدا بەڕیز دادەنێت، ئەم کارەکتەرانە دیدی خۆیان لە نێو رووداوەکانەوە بۆ بینەران دەگێڕنەوە، دیمەنەکەش بە چۆڵکردنی شوێنەکە بۆ ئانا کارێنینا و ئەلێکسی فرۆنسکی کۆتایی دێت. بۆ چڕکردنەوەی ئەم رۆمانە گەورەیە لەسەر شانۆ و گۆڕینی دیمەنەکان، رووداو و شوێنەکان، فۆندێکی رەش بە بارستایی پانتایی شانۆکە دێتە خوارەوە و پشتەوە و قووڵایی شانۆکە لە بەشی پێشەوە دادەبڕێت. بەم تەکنیکە ساکارە ئاراستەی رووداوەکان دەگۆڕێت و پاڵێکی خێراش بە تەمەنی کارەکتەرەکانەوە دەنێت و بازنەی قووڵبوونەوە و بەرەوپێشەوە چوونەکانیش فراوانتر دەکات.

یەکێك لە دیمەنە جوانەکانی تر ئەوەیە کە ئانا کارێنینای ماندووی عەشق و خۆشەویستی، ئانا کارێنینای تەنها و تێکشکاو لەناو کۆمەڵێ سەرینی گەورەی سپیدا کەوتووە، هەندێك جار تەنها سەری، هەندێك جار نیوەی جەستەی، یان دەستێکی بەدەرەوەیە و دیمەنەکە لەوە دەچێت، ئانا کارێنینا بە بەرزاییەوە، لە ئاسمانەوە و لەسەر فەرشی هەورەکاندا، وەك فریشتەیەکی نەخۆش راکشابێت و لەوێوە بڕوانێتە ئەو کۆمەڵگا نایەکسان و بێ بەزەییەی کە ئەوی تێدا دەژی.

ریژیسۆری شانۆنامەکە و بەپێی چەمکەکانی هونەری گێڕانەوە و لە چەندین دیمەن و شوێندا، کارەکتەرێك لە کارەکتەرەکان جیادەکاتەوە، دایاندەبڕێت و بۆ ساتێك دەیانکاتە حیکایەتخوان و هێڵە جیاوازەکانی رۆمانەکە، لە سۆنگەیەکی دراماتیکیدا کورت دەکاتەوە.

ئانا کارێنینا لە سەرەتاکانی دیمەنی یەکەمدا جلی رەشی لەبەردایە، لە ناوەڕاستی شانۆکەوە، کە وەك عاشقێکی بێ پەروا و تینوو دەردەکەوێت، جلی سپی لەبەر دەکات و لە دیمەنی بەرەو کۆتاییشدا سەراپای جلەکانی دەبێتە سوورێکی زەق و لە دوا دیمەنیشدا، کە هەموو شتێك لەدەست ئەدات و کۆتایی بە سەفەری عەشقەکەی دێت، وەك دیمەنی یەکەم دەچێتەوە ناو جلوبەرگە رەشەکەیەوە.

ریژیسۆری شانۆنامەکە کە هەر خۆیشی تێکستەکەی لە رۆمانەکەوە ئامادەکردووە، دیمەنەکانی سەرەتا و کۆتایی






لە دەروازەی هۆڵە گەورەکانیماڵی ئەرستۆکراتەکانەوە، لەگەڵ ریتمی سەما و مۆسیقا و کات بەسەر بردنەکاندا، لە دیدی کارەکتەرەکان و بارودۆخی دوێنێ و ئەمڕۆ و ئایندەی رووداوەکاندا، بە یەکەوە دەبەستێتەوە.

لە دوا دیمەنەکانی نەمایشەکەدا ریژیسۆر، ئانا کارێنینا بە تەنها لە پێشەوەی شانۆکە دادەنێت و بەهۆی دیوارێکی شورائاسای رەشەوە لە تێکڕای ژوورە ئەرستۆکراتییەکان، لە جیهانی ئاهەنگ و سەماکانی دادەبڕێت، لەودیو دیوارەکەوە سەما بەردەوامە و ژیان رێچکەی ئاسایی خۆی وەرگرتووە، لەمدیویشەوە ئانا کارێنینا وەك ئەوەی لەو جیهانە تووڕدرابێتە دەرەوە، بە تەنها دانیشتووە، لەم دیمەنەدا لە پشت شوراکەوە تەنها قاچی سەماکەرەکان دەبینین و گوێمان لە تەپەی پێ و قاقای پێکەنینیانە.



دوا چرکەساتەکانی نەمایشەکە و سەفەرەکەی ئانا کارێنینا بە تەنها و لە ویستگەی شەمەندەفەرێکدا کۆتایی پێدێت، ئانا کارێنینا هەموو شەمەندەفەرەکان، تەنانەت شەمەندەفەری ژیانیش بەجێیانهێشتووە، لە ویستگەیەکی چۆڵ و بە تەنها لەسەر کورسییەکی رەقوتەق، لە ساتەکانی مەرگدا لەچاو ون دەبێت. ئەوەی دەمێنێتەوە تەنها کورسییەك و ویستگەیەکی سارد و چۆڵە.



لەگەڵ چەپڵەڕێزانی بینەران و چوونە دەرەوەی خەڵکەکە، دەچمە دەرەوە، لەناو حەشاماتەکەدا بزر دەبم. بە راستەرێگاکەدا دەڕۆم و لەژێر ڕووناکی گڵۆپی سەرشەقامەکاندا سەیری ئەو هەموو کچە لێتلاندییە دەکەم و چەندین ئانا کارێنینا دەبینم، چپەدوو قسە دەکەن و بە چاوێکی پڕ لە میهرەبانییەوە پێدەکەنن و دەقریوێنن.

بەر لە بیست ساڵ، وەك پەناهەندەیەکی تەنها لە ریگا بووم، بە ترس و دوودڵییەوە هەنگاوەکانم دەنا، تەنها شوێنێکیش کە ئێستا لە یادم مابێت و ئەوسا بینیبم، گۆڕەپانی ئازادییە.



ئێستا وەك ئەوسا بە تەنها بەرامبەر پەیکەری ئازادی راوەستاوم، هەست بە بێدەنگی و تەنهاییەکی رەها، تەنهاییەکی بێدەنگ و کوشندە دەکەم. بەڵام لە تەنهایی ناترسم. هەست ناکەم تەنهام، بەڵکو هەستێکی بەهێزی دەروونیم بۆ تەنهایی هەیە: ترس و گومان لە تەنهایی، تاسە و تامەزرۆیی بۆ بوونی تەنهایی، تووڕەبوون لە تەنهایی، خۆشەویستی بۆ تەنهایی، رەهەندی تەنهایی و تەنهایی



لەگەڵ خودی تەنهاییدا. زۆر جار بە پەرۆشەوەم بۆ ساتەکانی تەنهایی و خۆم لە سندوقێکی تەنهادا توند دەکەم، دیوارێك لە تەنهایی دروست دەکەم کە کەس نەتوانێت پیایدا سەرکەوێت.

### مۆنۆمێنتێك بۆ ئازادی/ گۆڕەپانێك بۆ سەربەستی

گەلی لێتلاند مێژوویەکی خوێناوی و بەرەنگاربوونەوە و شۆڕشی یەك لەدوای یەکی هەیە و ئەم سەربەستییەی ئەمڕۆیان، تەقەلای بەرهەڵستی و جەنگێکی درێژە. ئەم گەلە بەهایەکی گەورەیان بۆ ئازادیی، بۆ سەربەخۆیی و بۆ هێماگەلە پیرۆزەکانی خۆیان هەیە و هەموو تەقەلایەك مێژوویەکە، هەموو بەردێك هێماگەلێکە، هەموو یادەوەرییەك پێداگرتنە بۆ سەربەستی و هەموو شەڕێك سووربوونە لەسەرگەییشتن بە مافەکانیان. «٩»

گۆڕەپانی ئازادیی یەکێکە لەم هێما پیرۆزانەی ئەم وڵاتە و لە هەموو کاتێکدا، شەو و ڕۆژ خەڵکی چەپکە گوڵی وەفا و سەربەرزی لەم گۆڕەپانەدا و لەبەردەم پەیکەری ئازادیدا دادەنێن.




ئەم پەرستگایەی گۆڕەپانی ئازادی ٤٢ مەتر بەرزە و ئەوپەیکەری ئافرەتەی کە بە شێوەیەکی ئەفسوونی بەسەر تاوەرەکەی ئەم مینیمیۆنتەوە

بەرزبۆتەوە، تاجەگوڵینکەیەکی بەرەو ناکۆتا و پانتاییە نادیارەکانی ئاسمان بەرزکردۆتەوە، ئافرەتەکەش بە میهرەبان، مرۆدۆست و سیمبوڵی ئازادی ئاماژەی بۆ دەکرێت «١٠». ئەم پەیکەرە لەساڵی ١٩٣٥ دا دروستکراوە و هێندە بە پێناسە و مێژوو و ترادیشونی ئەم گەلەدا ڕۆچۆتە خوارەوە، بووەتە شتێك لە سەروو هەموو شتەکانی ترەوە و تەنانەت دەسەڵاتی توندوتیژی داگیرکەری سۆڤیەتیش نەیوێراوە لایبەرێت «١١».

پشت دەکەمە ئافرەتە میهرەبانەکەی ریگا و بە بەردەمی پاسەوانەکاندا دەڕۆم، هەنگاوەکانم بەسەر شەقامە بەردینەکەدا دەنگ ئەداتەوە، هەروەك ئەوەی بە هۆڵێکی چۆڵ و هۆڵدا بڕۆم. لە بەری ئەوبەرەوە قووچکەی تاوەرێك دەبینم کە بە پێوە وەستاوە و زیاتر لە سینۆگرافیای شانۆییەکی بەردەوام دەچێت کە ئەکتەرەکانی بۆ هەتایە بەجێیان هێشتبێت.

### تاوەری بارووت

کە دەگەمە بەر تاوەرەکە و دەچمە ژوورەوە بۆم دەردەکەوێت یەکێکە لە گرنگترین و کۆنترین مۆزەخانەکانی ریگا و بە مۆزەخانەی شەڕی سەربەخۆیی لێتلاند ئاماژەی بۆ دەکرێت «١٢».

ئەمە تەنها تاوەرێکە لە کۆی ئەو هەژدە تاوەرەی کە لە سەدەی دوازدەدا بۆ بەرگریکردن لە شارەکە

دروستیان کردووە، هەروەها لەم تاوەرانەدا بارووتیان دروست کردووە و هەر لەبەر ئەوەشە کە بە تاوەری بارووت ئاماژەی بۆ دەکرێت١٣.

لە دوای سەربەخۆیی لێتلاند، ئەم تاوەرە کراوە بە مۆزەخانەی شەڕ یان شۆڕش و بەرجەستەی مێژووە دوور و درێژە خوێناوییەکەی ئەم وڵاتە دەکات. تاوەرەکە لە ناوەوە چەندین نهۆمە، نهۆم لەدوای نهۆم بە شێوەیەکی بازنەیی لە خوارەوە بۆ سەرەوە بەرز دەبێتەوە و ساڵ لەدوای ساڵ لاپەڕەکانی مێژووی ئەم وڵاتە هەڵئەداتەوە. لە یەکەم نهۆم جەنگی یەکەمی جیهانییە و لە دوا نهۆمیش وێنەیەکی پرشنگداری سوپای ئەمڕۆی ئەم وڵاتەیە کە بەشێکە لە سوپای ناتۆ و ئەوروپای یەکگرتوو و لە شوێنە جیاوازەکانی دنیا، بۆ نموونە لە ئەفغانستان و عێراق ئامادەییان هەیە «١٤».




لەم مۆزەخانەیەدا ئەو چەکانەی بە درێژایی مێژوو لە شەڕەکاندا بەکارهاتووە، جلوبەرگی سەربازی، جۆرەکانی پەیوەندیی و لاسلکی، ئەفیش و وێنەی پروپاگەندە، ئامرازەکانی بەرگری و فریاگوزاری، وێنە، دۆکیومێنت، نامە، بەڵگەنامە، نەخشە، پێشانگا، جۆری خواردن و کەلوپەلەکانیان، جۆرەکانی بەندیخانە و ئەشکەنجە، ڕەو و ڕاکردن و فیلمی دۆکیۆمێنتی کە لە ڕاڕەو و ژوورەکاندا بە بەردەوامی پیشان دەدرێت ... هتد دانراوە «١٥».



لە مۆزەخانەی شەڕ دێمە دەرەوە، هەستێکی قووڵی شەڕ گەمارۆی ئەو تەنهاییە چڕەی داوە کە لە ناوەوەمدا دەسوڕێتەوە، بە کۆڵانە باریکەکەی بەردەمی تاوەرەکەدا دەڕۆم، بەلای پارلەماندا ڕەت دەبم و دەچمە ئەو باخە سەوزەی بە لێواری کەناڵە بچووکەکەی ناوەڕاستی شاردا دەڕوات، خۆی هەڵواسیوە. لەم باخچەیەدا پێنج بەرد بە دیزاینێکی جوان بۆ یادی ئەو پێنج کەسەی کە لە سەرەتای پشێوییە سیاسییەکاندا و لە دەسپێکی بانگەشەی سەربەخۆییدا لە ٢٠ ی مانگی یەکی ساڵی ١٩٩١ دا لەلایەن هێزەکانی سۆڤێتەوە دەکوژرێن، دانراوە «١٦».



لەسەر ئەژنۆ بەرامبەر بەم بەردانە دادەنیشم، بە قووڵی لێیان ورد دەبمەوە، مێژوویەکی پڕ لە خوێن، داگیرکردن و شەڕیان تێدا دەبینم، لە هەمانکاتدا هیوایەکی گەورە لە چرکەساتێکدا بووەتە بەرد، وەستاوە و بۆ هەتاهەتایە لە زەمەنی ئازادی و قوربانی و ئایندەیەکی تردا چەقی بەستووە.



بەدیار لاشەکەی

خۆمەوە





لە ژوورێکی بەردیندا
وەستاوم
من لەوێ بە سیمایەکی
بەردینەوە
مردم «١٧».

دەگەڕێمەوە بۆ بەر خانووبەرەی پەرلەمان، لەوێ پەیکەری قوربانییەکانی ئەو رۆژە چاوەڕێم دەکەن. پەیکەرەکان بە ریز و بە سیما بەردینەکانیانەوە لە چاوەڕوانی میوانەکانیاندان «١٨». کە لێیان دەڕوانم، بۆ تاوێك هەست دەکەم لەگەڵم دەدوێن!

- لە کوێوە هاتوویت؟
- ئێمە بووینەتە بەرد، بۆ ئەوەی تا هەتایە بژین.
- زەمەن لە لەپی دەستی مندا وەستاوە.
- زەمەنی تۆ لە کوێوە بۆ کوێ دەڕوات.
- دەزانیت ئێمە ئامادەی هەموو دانیشتنەکان دەبین.
- مەبەستی لە دانیشتنەکانی پەرلەمانە.
- مێژووی ئێمە مێژووی ئەم شارەیە.
  - ئەی مێژووی تۆ!
  - مێژووی تۆ لە کوێوە دەست پێدەکات؟

ماڵئاوایی لە پەیکەرەکان دەکەم، بەبێ ئەوەی بتوانم وەڵامی تەنها تاکە یەك پرسیاریشیان بدەمەوە، دەچمە راڕەوەکەوە، لە ئاڵاکەیان دەڕوانم و لە دەرگای ئەو سەرەوە دێمە دەرەوە، بە هەستێکی خەمناك و بە تەنهاییەکی بێدەنگ تا هوتێلەکەم ناوەستم «١٩».

**پەراوێزەکان**

١/ شاری ریگا لە لیستی ئۆرگانی یۆنسکۆی نەتەوە یەکگرتووەکاندا، وەك شارێکی دێرین و کولتووریی جیهانیی تۆمار کراوە.
٢/ وڵاتانی باڵتیك: ئێستلاند، لێتلاند، لیتوان مێژوویەکی هاوبەشیان هەیە و خەڵکی لە ساڵەکانی دوو هەزاری بەر لە لەدایکبوونی مەسیحەوە لەم ناوچانەدا جێگیر بوون. هەرچەندە ئەم سێ وڵاتە لە ساڵی ١٩٩١ دا سەربەخۆ بوون، بەڵام لەڕووی ئەزموونەوە هاوبەش و لە یەکترەوە نزیکن، هەرسێکیان وەك یەك وڵاتەکانیان داگیرکراوە. شارەکانیان خاپورکراوە، خەڵکەکەی چەوسێنراونەتەوە و راگوێزراون. ئەم سێ



وڵاتە پێکەوە و وەك یەك بۆ سەربەستی و ئازادی هەوڵیانداوە و خەباتی هاوبەشیان کردووە، بەڵام لەگەڵ ئەم هەموو شەڕ و داگیرکردنانەدا، توانیویانە زمان، کولتوور، دابونەریت و پێناسی تایبەتمەند و نەتەوەیی خۆیان بپارێزن.

٣/ هەرچەندە یادەوەرییەکانی شەڕ و داگیرکردن و کۆلۆنیکردنی ئەم وڵاتە بە هەموو شوێنێکییەوە دیارە، بەڵام کۆمەڵگەکە و هەموو وڵاتەکە لە گۆڕانکارییەکی بەردەوامدایە و ئەم نەوە نوێیەی کە بە ئازادی لە دایك بووە و بە سەربەستی گەورە بووە، ڕۆحێکی مۆدێرنی بەم وڵاتە بەخشیوە.



٤/ شاری ریگا لە ساڵی ١٢٠١ دا و لەلایەن قەشەیەکی ئەڵمانییەوە بەناوی ئەلبێرت ناوێکەوە دروستکراوە و هەر زوو دەبێتە ناوەندێکی گرنگی بازرگانی لەنێوان وڵاتانی باڵتیك و ئەورووپادا.

٥/ هیتلەر ئەم خانووەی لە ساڵی ١٩٤١ دا تۆپباران کردووە، کە روسیاش شارەکەداگیر دەکەن، پاشماوەکانی ئەم خانووە بە تەواوەتی تەخت دەکەن. لە ساڵی ١٩٩٩ دا و لە یادی ٨٠٠ ساڵەی دامەزراندنی ریگادا، سەرلەنوێ کۆپییەکی یەکاویەکی ئەم کۆشکە دروست دەکەنەوە و بۆ ئەم کارەش هەموو خەڵکی ریگا هاریکارییان کردووە لە بنیاتنانەوەی ئەم کۆشکە گەورە مێژووییەدا.



٦/ چەندین شانۆی گرنگ لە ریگا هەن، لەوانە شانۆی لێتلاندی نەتەوایەتی، نەمایشەکانیان بە زمانی لێتی کە زمانێکی تایبەتمەند و سەربەخۆیە و بە هیچ شێوەیەك لە زمانی رووسییەوە نزیك نییە، پێشکەش دەکەن. شانۆی نەتەوایەتی رووسی کە زیاتر بە زمانی رووسی نەمایشەکانیان پێشکەش دەکەن. شانۆی نوێی ریگا و چەندین گروپی ئەزموونکار و شانۆی سەربەستی دەرەوەی دامودەزگا فەرمییەکان هەن.



٧/ هەرچەندە تۆڵستۆی ڕۆمانی ئانا کارێنینای دوای ڕۆمانی «شەڕ و ئاشتی» نووسیوە، بەڵام ئانا کارێنینای بە یەکەم ڕۆمانی خۆی ناوزەد کردووە؛ ئانا کارێنینا، کارەکتەرەکانی، رووداوەکانی و هەموو ئەتمۆسفێرەکەی زیندووە و لە هەموو کات و شوێنێکدا دەژی و لە بزاڤێکی بەردەوامدایە. ئەو پرسانەی لەم ڕۆمانەدا وروژاوە، تا ئێستاش چاوەڕوانی وەڵامەکانیانین.



٨/ ئەم نمایشەی ئانا کارێنینا بۆ یەکەمجار لەسەر شانۆی نەتەوایەتی لێتلاند لە ٢٠١٠/١٢/٢ دا نەمایشکراوە و من لە گەشتێکی تایبەتمدا بۆ شاری ریگا لە ٢٠١١/٣/١١ دا نمایشەکەم بینیوە.



٩/ ریگا لە سەدەی شازدەدا لەژێرِ دەسەڵاتی پۆڵۆنیادا دەبێت، پۆڵۆنییەکان دوای ئەڵمانییەکان دێن و



هەموو ناوچەکە دەخەنە ژێر دەسەڵاتی خۆیان. لە ساڵی ١٦٢١ دا سوێد دوای شەڕێکی درێژخایەن ریگا لە پۆڵۆنییەکان دەسەنێتەوە و دەبێتە کۆڵۆنی سوێد. سوێدییەکان بە جیاوازی لەگەڵ ئەڵمانی و پۆڵۆنی و رووسەکاندا کە ئەم وڵاتە داگیر دەکەن، قوتابخانە دروست دەکەن، رێگەوبانەکان تازە دەکەنەوە، رێگا بە بەکارهێنانی زمانەکەیان ئەدەن و تەنانەت ئینجیلیشیان بۆ وەردەگێڕنە سەر زمانەکەی خۆیان. لە ساڵی ١٧١٠ دا کە دەسەڵاتی سوێد لە ناوچەکەدا بێهێز دەبێت، سوپای رووسیا دێتە ریگا وەو شارەکە و وڵاتەکە بە تەواوەتی داگیردەکەن. ساڵی ١٧١٠ دەبێتە دەسپێکی دوو سەد ساڵەی دەسەڵاتی رووسیا لە ناوچەکەدا. لێتلاند دوای شەڕ و پێکدادانێکی زۆر و لە ساڵی ١٩٢١ دا سەربەخۆیی خۆیان بەدەست دێنن و لە ماوەی نێوان هەردوو جەنگی یەکەم و دووەمی جیهانیدا سەربەخۆ دەبن. لە ساڵی ١٩٤٠ دا سوپای یەکێتی سۆڤییەت دێتەوە و ریگای پایتەختی لێتلاند داگیر دەکەن، لە ساڵی ١٩٤١ دا ئەڵمانیای نازی، سوپای رووسی دەکاتە دەرەوە و خۆیان دەست بەسەر وڵاتەکەدا دەگرن، لە ساڵی ١٩٤٤ دا رووسیا سەرلەنوێ ریگا داگیر دەکاتەوە. مۆسکۆ بە شێوەیەکی درندانە هەموو ئاساری ئەو بیست ساڵ

سەربەخۆییەی ئەم وڵاتە دەسڕێتەوە، دەسەڵاتدار و سیاسەتمەدارەکانی حکومەتەکەیان لەسێدارە ئەدات، ئاڵاکانیان دادەگرێت، سروودی نیشتمانییەکەیان قەدەغە دەکرێت و بە تەواوەتی زمان و کولتووری ئەم وڵاتە لە زمان و کولتووری رووسیدا دەتوێننەوە.

١٠/ ئەو ئەستێرە سێ کوچکەییەی ئەم ئافرەتە میهرەبانە بەسەر دەستەکانییەوە بەرزی کردۆتەوە، گوزارشت لە سێ ناوچەی مێژوویی ئەم وڵاتە دەکات. پەیکەرەکە لە خوارەوە و بەهەر چوار لادا، پەیکەر و فیگوری تری پێوەیە، ئەم پەیکەر و فیگورانەش هێماگەلی رۆحیانەت، کار، خێزان و بەرگریکردن لە نیشتمان دەکات.

١١/ ستالینییەکان بە هەموو شێوەیەك ئەوەیان لە خەڵکی ئەم شارە قەدەغە کردبوو کە چەپکە گوڵ لەسەر ئەم مەزارە دابنێن. هەروەها بۆ کەمکردنەوەی بەهای ئەم مینیۆمێنتە، پەیکەرێکی گەورەی لینین یان لەبەردەمدا دروستکردبوو.

١٢/ ریگا مۆزەخانەی زۆری تێدایە و هەموو شتێك مۆزەخانەی تایبەتی خۆی هەیە، هەر بۆ نموونە: مۆزەخانەی مێژووی ریگا، مۆزەخانەی سەنگەر گرتن، هونەر، ئیشی دەست و دیزاین، فەخفوری، فۆتۆگرافی، مێژووی دەرمان، ماتۆڕ، ئیتنۆگرافی، جولەکەکانی لێتلاند، کۆلۆنیالیزم، مۆزەخانەی لێتلاند بۆ هێزە داگیرکەرەکان، مۆزەخانەی



نەتەوەیی لێتلاند بۆ هونەر، مۆزەخانەی ئاژەڵی لێتلاندی..... هتد.

١٣/ بۆ یەکەمجار لە ساڵی ١٩١٦ دا ئەم تاوەرە کراوەتە مۆزەخانەی سوپا و بە وێنە و دۆکیۆمێنت گوزارشت لە تەقەلاکانی شەڕی سەربەخۆیی و ڕووداوەکانی جەنگی یەکەمی جیهانیی کردووە، کە یەکێتی سۆڤییەت لە کاتی جەنگی دووەمی جیهانیدا ئەم وڵاتە داگیر دەکات، ئەم شوێنە دەکاتە مۆزەخانەی شۆڕشی ڕووسی.




١٤/ کۆنترین شتەکانی ناو ئەم مۆزەخانەیە، ئەو تۆپانەیە کە لە سەدەی چواردەدا بەکارهاتووە. زیاتر لە بیست ساڵە سەربەخۆین، حکومەتی خۆمان هەیە و پارە ڕژاوە، بەڵام تا ئێستا نەتوانراوە مۆزەخانەیەك لە کوردستان دروست بکرێت و مێژووی چەوساندنەوە و داگیرکردنی کوردستان بۆ نەوەکانی دوای خۆمان بگێڕێتەوە.

١٥/ کەلە ساڵی ١٩٨٥ دا گۆرباشۆف دەسەڵاتی گرتە دەست، دەستەواژەی «پێرێسترۆکیا» واتە کرانەوە، ریفۆرم و گۆڕانکاری بووە دروشمی حکومەتەکەی. ئەم دروشمانە کاریگەرییەکی بەهێزو ڕاستەوخۆی بەسەر وڵاتانی بەڵتیك- ەوە دەبێت. لەپڕ مرۆ دەیتوانی بەبێ ترس باسی ئازادی و سەربەخۆیی، باسی مافی چارەنووسی بکات و سەرلەنوێ ئاڵا نەتەوەییەکانی خۆیان هەڵبکەن. لە ساڵی ١٩٩٠ دا ئێستلاند، لێتلاند و لێتوان بە ئاشکرا باسی پلانی ئایندەی خۆیان و جیابوونەوەیان لە ڕووسیا و سەربەخۆیی خۆیان دەکرد. ئەو کودەتا کورتە بێ ئەنجامەی دژی گۆرباشۆف کرا، بووە هۆی سەربەخۆیی ئەم وڵاتانە و لە مانگی هەشتی ساڵی ١٩٩١ دا سەربەخۆیی خۆیان ڕاگەیاند.





١٦/ پارچە شیعرێکی خۆمە بە سوێدی نووسیومە و لە ساڵی ٢٠٠٦ دا لە ستۆکهۆڵم بڵاوکراوەتەوە. مەبەست لە قوربانییەکانی ساڵی ١٩٩١ ە.

١٧/ خانووبەرەی پەرلەمان کە دەکەوێتە دەرەوەی سنوورەکانی بەشە دێرینەکەی ڕیگا، لەنێوان ساڵانی ١٨٦٣ بۆ ١٨٦٧ دا دروستکراوە و تا ئێستا بۆ چەندین جار نۆژەن کراوەتەوە. لە سەرەتادا ئەم شوێنە بۆ کۆبوونەوەی بازرگانەکانی ناوچە و هەرێمەکان بەکارهێنراوە، لەنێوان ساڵانی ١٩١٩ تا ١٩٣٤ دەبێتە پەرلەمان و لەکاتی جەنگی دووەمی جیهانیدا، نازییەکان دەیکەن بە بارەگای یەکە سەربازییەکانیان، بە تایبەتی یەکەی هیتلەر کە تایبەت بووە بە قەلاچۆکردنی قەرەج و جوولەکەکانی ئەم وڵاتە. کە ڕووسەکانیش دێن، دەبێتە بارەگای سەرەکی دەسەڵاتی حیزبی کۆمۆنیستی سۆڤییەت لە لێتلاند، لە ساڵی ٢٠٠١ ەوە، سەرلەنوێ کراوەتەوە بە پارلەمانی ئەم وڵاتە.







# دار سێوەکەی خەسوم

سەردار عەزیز

چەند رۆژێك لەمەوپێش، لە شەوێکی رەهێڵەی پڕ باراندا، لاداکەوت. ئەگەرچی هەموان چاوەروان بوون، بەڵام کەس روداوە نەبووەوە. دارسێوەکە لە تەنیشت کلێسا بچکۆلەکەوە

دواجار دار سێوەکە بە بەبێ هەست رووبەرووی ئەو بوو، لە نێوان کادێن و ماڵە

گەورەکەدا، لە قەدپاڵی چیایەکی سەخت لە ئەلپ.
گەر بتەوێ بگەیتە ئەوێ هەرگیز ئاسان نییە. دەبێ لە شارێکی گەورەوە بە شەمەندەفەر سەفەر بکەی. شارێکی گەورەی وەك میونخ، رۆما یان ڤیەننا. بەڵام پێویست ناکات برۆیت بۆ ئەوێ، هەر چەندە ساڵانە بە هەزاران گەشتیار دەچن بۆ ئەوێ. گەر ئارەزوو دەکەی بە سەر بەفردا بخلیسکێی، بەقەد شاخی بێ ئەندازە سەختدا هەڵزنێی، شەوان لە ماڵی لە تەختە لە دارستانی دوور و چر ساتێك بە سەر بەریت، یان دەتەوێت دوا پانتایی خودا پەرستی لە ئەوروپا ببینی، ئەوە سەفەر بکە بۆ ئەوێ.
کە گەشتی ویستگەیە کۆنە، هەست دەکەی ئیتالیایە، بەبێ ئەوەی ئیتالیا بێت، هەست دەکەی نەمسایە بەبێ ئەوەێ نەمسا بێت، هەست دەکەی هێشتا لە بەڤاریای، بەڵام هەڵەی. بۆ ئەوەی بگەیتە دار سێوەکە لە تەنیشت ویستگەکەوە بچۆرە پاسێك، خۆت ئامادەبکە بۆ هەوراز، بۆ پێچاو پێچ، بۆ رێگای باریك و سەخت.
دارسێوەکە هەمیشە لە بەرچاو بوو. یەکەم لێدوانی خەسوم ئەوەبوو، کە ماڵەکە هێندەی تر رووت بوەوە. پێویست بەوەناکات شارەزابێت لە سایکۆئەنالیسی لاکان. هەموو کەس دەیزانی ئەو وشانە دەربڕی خەمێکن فراوانترە لە خەمی لە دەستدانی دارسێوەکە. پار خەسوم مێردەکەی لە دەستدا. لەوەتەی هەست دەکات دونیا هەتا بێت رووتتر دەبێت، چۆڵتردەبێت، تەنهاتر دەبێت. مێردی خەسوم بە شێرپەنجە مرد. پیاوێکی چالاك لە کۆمەڵگادا، خەڵکی هەموو دۆڵەکە دەیانناسی. دۆڵ، لێرە لە ئەلپ، پانتاییەکی جودایە لە جێگاکانی تر. دۆڵ ئەو جێگا فراوانەیە کە چەندین گوند و هەندێجار شار و شارۆچکەش لە خۆی دەگرێت. دۆڵ لە هەمانکاتدا ئاماژەی ئەوەیە کە سەختە بگەیتە جێگایەکی تر جگە لەوەی کە بە دۆڵێکدا سەفەر بکەی. تەنانەت بەرێوەبردنی دەزگاکانی حکومەتیش بەم شێوەیە رێکخراوە. خەڵکی دۆڵەکان دابەشبوون بۆ ئەوانەی کە لە بەری خۆرن و ئەوانە خەڵکی سێبەرن. خەڵکی خۆر کەمێ زیاتر ژیان دۆستترن. دەڵێن جاران قەشەیەك هەبووە هەر بە تەماشاکردنێك توانیویەتی هەرکەسێك پۆلێنکات، ئایا خەڵکی خۆرتاوە یان نسێم. دارسێوەکە لە بەشی نسێمە. کەس نەیئەزانی چۆن رواوە، یان لە راستیدا کەس یادی نەمابوو. یان راستیتر هیچ مرۆڤێك لە ژیاندا نەمابوو، یادی بێت ئەو دارسێوە لەوێدا نەبوو. هەموو شتێك هەمیشە






دەربارەی دەوترا ئەوەبوو، کە تەمەنی لە سەد ساڵ زیاترە. بۆ یەکەم جار من نزیکەی حەوت ساڵ لەمەوپێش بینیم. لە قەدیدا مێژوویەك دیاربوو، لق و چڵەکانی ترتۆك بوون. گەڵاکانی وردتر لە دارسێوەکانی تر. هەموو دەیانگووت، جۆرێکە لە جۆرەکەی نەماوە.
ئێستا کلێسا بچکۆلەکە، کە هەرگیز بۆ هیچ بەکارنایەت، جگە لە چاوشارکێی نامۆ و رافائیل، بە زەقی دەرئەکەوێت. منیش وەك هەموان جۆرێك هۆگریم هەبوو بە دار سێوەکەوە. تاقانەیەکەی سەرنج راکێش بوو، هەروەها تامی سێوەکانی. بەڵام هەمیشە خەیاڵم دەکرد دەبێت ئەم دارسیوە چی دیبێت، چەندی دیبێت، گەر بێتە زمان چی بگێرێتەوە. دڵنیام تەنها دەربارەی بەفری زۆری مانگەکانی زستان و ئاڵ و والای وەرزەکان نادوێت. ئەم دارسیوە شایەدحاڵی مێژوویەکی تایبەتە لە چەندین ئاستدا. سەرەتا مێژووی ئەم ماڵە، کە مێژووەکەی دەگەرێتەوە بۆ سەدەی هەژدە. لەم دواییەدا خەزورم کاتێك ماڵەکەی نۆژەنکردەوە هێندە شتی دەگمەنی مێژوویيان دیەوە بریاریاندا مۆزەخانەیە بچکۆلە دروستبکات.



ئێرە بەشی باشوری ناوچەی تیرۆڵە. تیرۆڵ وەك کوردستان لە نێوان سنوورەکان دابەشبووە، هەندێکی لە ئوتریشە و هەندێکی تری لە ئیتالیا. مێژووی ئێرە هەتا ئێستا مێژووی ناسەقامگیری و جەنگ و دژایەتی و ململانێیە. سنوورەکان لە هەرکوێدا بکێشرێن قەیرانی زۆر بە دوای خۆیاندا دەهێنن. سنوور هێڵێکی سیحراوی نەعلەتیە. سەرەتا لە سەر پەرەی کاغەز دەکێشرێت، لە سەر مێزی فراوان، خەڵکانێك کە رەنگە هەرگیز ناوچەکەیان نەبینێبێت. لە کێشانیدا ناو و سروشت و شێوازی هەڵسوکەوت و کەلتور و زمان و سیکسیش دەگۆرێت. سنوور کە بەدەورتدا دەکێشرێت ئیتر یان دەکەویتە ناویەوە یان دەرەوەی، کە لە ناویەوە بووی هەوڵ ئەدا قوتتدا، کە لە دەرەوەی بوی نەفرەتت لێئەکات. هیچ هێندەی سنوور نەخۆشیدار نییە. وەك دەبینن دار سێوەکە لە نێوان کادێنێك و ماڵێکی گەوری دێرین و لە تەنیشت کلێسایەکی بچکۆلەدا بوو. هەریەك لە ئەم جێگایانە ئاماژەناسی خۆیان هەیە. کادێنەکە ئاماژەیە بۆ کۆمەڵگایەکی ئاژەڵداری، جوتیاری، لادێیی. ماڵە گەورەکە بۆ خێزانی گەورە و دێرینێتی بۆ مێژوویەکی دوورو درێژ بۆ نیشتەجێبوون لەوێ. کلێساکە هەروەها یانی ئاینی بوونی ئەم دونیایە. لە نێوان جوتیاری و ئاینی و خێزانی گەورەدا درامای زۆر دەگوزەرێت. هەر ئەمەشە وەهایکردوە یەکێك لە ژانرە سەرەکیەکانی ئەدەب لەم ناوچەیە ئەدەبی خێزان بێت، مەبەستم ئەوەیە ئەو رۆمانانەی کە سەربوردەی چەند

نەوەی خێزانەکان ئەگێرنەوە. ئەم ناوچەیە تایبەتە، کاتێك لە ماڵەکەدا دەمانچەیەك دۆزرایەوە، هەموو بە حەپەسانەوە روانیان، ئامراز و بابەتی چ رۆژگارێکە. ئێرە تیرۆڵی باشورە. ناوچەیەکی شاخاوی سەختی باکوری ئیتالیا. لێرە کەمینەیەکی ئەڵمانی زمان لە ناو سنووری ئیتالیادا دەژین. کەمینەیی و سنوور و بوون لە وڵاتێکی تر هەموو سەرچاوەی خەبات بوون بەتایبەت لە بەرامبەر حکومەتێکی فاشیستی وەك مۆسۆلۆنی و کۆمەڵگایەکی فاشیستی تری وەك کۆمەڵگای ئیتالی.




یەکەمجار کە دارسێوەکەم بینی نزیکەی حەوت ساڵ لەمەوپێش بوو. ئەو دەم بەیانیەکی زووبوو، سەرتاپا شەوەکەی لە شەمەندەفەردابووم لە رۆماوە. سەرەتا هێندە سەرنج راکێش نەبوو، پیر و پشت کۆماوە و ماندوو دیاربوو. پاش چەند ساڵێك کاتێك یەکێك لە ئاینگەراکانی گوندەکە پێشنیاری بڕینەوەی کرد چونکە رەگەکانی دەبوونە مایەی روخانی کلێسا بچکۆلەکە بەلامەوە پێشنیارێکی سەیربوو. بۆچی خانوەیەکی بچکۆلە کە هیچ سودێکی نەبوو تەنها لە بەر ئەوە لە شێوازێکی تایبەتدا دروستکرابوو بە سودتر و پیرۆزتر و باڵاترە لە دارسێوێکی دەگمەنی پڕ بە تام.



من بەبێ دەنگ مامەوە چونکە خەڵکی ئەم ناوچەیە لە ئاستی ئەوەدا نین مرۆ لە ئاستی ئاوەزدا بتوانێت قسەیان لە گەڵدا بکات، بەتایبەت منێك وەك موسوڵمان تەماشا دەکرام. ئایندارانی دوژمنی سەرسەختی ئاینداره خاوەن ئاینە جیاوازەکانن.




تایبەتمەندی دارسێوەکە بۆ من لەوەدا بوو کە ختوکەی یادەوەری ئەدام. لە گەرمیان لە ساڵی هەشتا و هەشت ئێمە دار تویەکی جوانمان هەبوو، من ئەودەم هێشتا مێردمنداڵ بووم، لە سێبەریدا سەعیم ئەکرد، خەیاڵی گەورە و فراوان، بەڵام کە گوندەکەمان روخا دارتوەکەش لە تینواندا وشك بوو. گەرچی دارسێوەکە تەمەن پیری و سروشت خستی، بەڵام لە گەڵ دارتوەکەدا لەوەدا لەیەك ئەچوون کە کۆمەڵێك یادەوەرییان لەگەڵ خۆیاندا بۆیەکجاری برد.



رۆژی دوایی دارسێوەکە لەت لەتکرا. پاشان بە ئەندازەیە رێك لە سوچێکدا بۆ زستان دانرا. کاتێك نامۆ و رافائێل پرسیان، دارسێوەکە چی بەسەردێت منیش دڵڕەقانە وتم دەبێتە دوکەڵ و خۆڵەمێش.








تەنیاییەکی پڕ هەراوزەنا، ڕەوایەتی تاکوێژییانە و دەروونگەرایانەی کرێکارێکی دەستگەی پرێسە، بە ناوی هانتا، ئەو لە ژێرزەمینێکی شێداردا، کە کۆگەی کاخەزی گەڕاوەیە، ڕۆژگار بەسەر دەبات و کتێبگەلێک، کە لەلایەن دەستگەی سانسۆرەوە ڕەوانە دەکرێن؛ دەکاتەوە بە هەویر. هانتا، بە خوێندنەوەی ئەم کتێبانە، دنیا بە جۆرێکی دیکە دەبینێت.
تەنیاییەکی پڕ هەراوزەنا، زۆر خەسڵەتی بیرەوەرینامەی تێدایە. لەم ڕۆمانەدا، هرابالّ دەگەڕێتەوە بۆ دەیەی پەنجاکان کاتێک کە ڕێک وەک هانتای گێڕەرەوەی کتێبەکە، لە بنکەیەکی کاخەزبەکاربردنەوەدا لە پراگ ئیش دەکات. ئەو ئیشە یەکێک بووە لەو ئیشە زۆرانەی کردبووی، بەرلەوەی بە یەکەمین کتێبی خۆی، کە لە ساڵی ١٩٦٣ و لە تەمەنی نزیکەی پەنجا ساڵیدا چاپی کرد، ببێتە یەکێک لە ڕووخسارە هەرە دیارە کولتوورییەکانی وڵاتی چیک.
هرابالّ، لە بارەی «تەنیاییەکی پڕ هەراوزەنا» و هانتای کەسێتیی سەرەکیی ڕۆمانەکەوە دەڵێ: «ئەم تێکستە پێکەوەگرێدانێکە لە نێوان ئەوەی کە هانتای واقیعی دەیڵێت و ئەوەی کە من خۆم لە بارەی دونیای ئەدەب و هونەرەوە فێری بووم، هانتا هەبووە بەڵام ئەو لیاقەتە ڕووناکبیرییەی نەبووە، کە من پێم بەخشیوە.»

هرابالّ، پێیوایە تەنیاییەکی پڕ هەراوزەنا، باشترین کتێبیەتی، یەکێک لە دەرەنجامەکانی جێکەوتنی ئەوە وەک نووسەرێک، تەنانەت پێیوایە، کە ئەو ڕەنگە تەنیا لەبەر ئەوە ژیابێت، تا بتوانێت ڕێک ئەو کتێبە بنووسێت.
ئەم ڕۆمانەی بوهومیل هرابالّ، لەلایەن شاعیر و وەرگێڕ، دلاوەر قەرەداغییەوە، لە زمانی سویدییەوە وەرگێڕدراوە و ناوەندی «غەزەلنووس» چاپ و بڵاوی کردووەتەوە.

بوهومیل هرابالّ
تەنیاییەکی پڕ هەراوزەنا
لە سویدییەوە: دلاوەر قەرەداغی



# لەمنداڵێکی جوتیارەوە بۆ خەڵاتی نۆبڵ

## ٥٧ ساڵی خایاند

سەردەمی ئەدەب

ناوە ڕاستەقینەکەی «گوان مۆیی»ە،
لەدایکبووی هەرێمی گاومییە
ژیاوە. لە کاتی شۆڕشی
کاربکات وازی لە
گۆڤارێکی ئەدەبیدا

نازناوە ئەدەبییەکەی «مو یان»ـە واتا قسە مەکە.
لە باکوری خۆرهەڵاتی چین. لە خێزانێکی هەژاری جوتیار
کلتوری ماوتسی تۆنگ لە تەمەنی دوانزە ساڵیدا بۆ ئەوەی
قوتابخانە هێناوە. یەکەم چیرۆکی لە ساڵی ١٩٨١دا لە
بڵاوکراوەتەوە. ساڵی ١٩٨٦ یەکەم نۆڤڵێتی بڵاوکردۆتەوە.
یەکێك لە ڕۆمانە سەرکەوتووەکانی کێڵگەی سوور کە زەنگ یمۆ لە ساڵی ١٩٨٧



کردوێتی بە فیلم. ڕۆمانەکانی تری وەك «توێکڵی سیر» و «خێمن ناو و حەوت ژیانەکەی».

مو یان بە یەکێك لە هەرە نووسەرە گەورەکانی چین ئەژمێرێت، تیراژی ڕۆمانەکانی بە زمانی چینی ئەگاتە دووسەد هەزار دانە. شێوازی نووسینی ڕۆمانەکانی مو یان نزیکە لە واقیعی سیحری، ئەگەرچی لە کاتی پێدانی خەڵاتەکەدا شێوازی نووسینی ئەو بە شێوازی واقیعی هەڵبزرکاو «هەلوەسە» ناوبرا، لێکچونی ئەزمونی نووسینی مو یان زۆر جار بە ئەزموونی هەردوو نووسەری جیهانی گابریا گارسیا مارکیز و ولیەم فۆکنەر ئەچوێنرێت.

پێدانی خەڵاتی نۆبڵ بە مو یان بووە هۆی دروستکردنی ناڕیزاییەکی زۆر لەناو نووسەران و ڕۆشنبیرانی دنیادا. یەکێك لەو نووسەرانەی بە توندی ڕەخنەی لە مو یان گرت، هێرتە میللەری خاوەن خەڵاتی نۆبڵ بوو، هێرتە میللەر پێدانی ئەم خەڵاتەی بە مو یان بە کارەساتێك لەقەڵەمدا.

ڕۆمانەکانی مو یان وەرگێڕاون بۆ زۆرینەی زمانەکانی دنیا، تا ئێستا هەژدە ڕۆمانی وەرگێڕاوەتە سەر زمانی فەرەنسی.

بەشێك لە وتەی مو یان لە ساتی وەرگرتنی خەڵاتی نۆبڵی ٢٠١٢

من پێموایە هەمووتان کە ئێستا لێرەدا ئامادەن لە ڕێگەی تەلەفزیۆن و ئینتەرنێتەوە جۆرێك تێگەیشتنتان لەسەر هەرێمی گاومی لە باکوری خۆرهەڵات هەیە. ڕەنگە باوکە نەوەد ساڵەکەمتان بینیبێت، یان براکانم و خوشکەکانم، خانمەکەم و کچەکەم و کچی کچەکەم کە تەمەنی یەك ساڵ و چوار مانگە. بەڵام ئەو کەسەی کە من لە هەموو کەس زیاتر لەم ساتەدا غەریبی ئەکەم دایکمە، ئێوە هەرگیز دایکم نابینن. لەو کاتەوەی لەوەرگرتنی خەڵاتی نۆبڵی ئەمساڵ بۆ ئەدەب ئاگاداریان کردمەوە زۆر کەس بەشداری ئەم شەرەفەیان لەگەڵدا کردووم، بەڵام ئەوەی هەرگیز ناتوانێت لەگەڵمدا بەشداربێت دایکمە. دایکم ساڵی ١٩٢٢ لەدایك بووە و لە ساڵی ١٩٩٤ مردووە. سەرەتا لە خۆرهەڵاتی دێکەمان لە ژێر یەکێك لە درەختەکانی باخی قۆخەکاندا بەخاکمان سپاردبوو، بەڵام ساڵی ڕابردوو بڕیاردرا هێڵی ئاسن ڕێك بەناو باخی قۆخەکاندا ڕابکێشن، بۆیە ئێمەش ناچاربووین قەبرەکەی بۆ شوێنێکی



زۆر دورتر لەوێ بگوازینەوە.
کاتێك قەبرەکمان هەڵدایەوە
بینیمان دەمێکە تابوتەکەی ڕزیوە
و ئێسك و پروسکی دایکیشم
بۆتە نەرمەخاك. بۆ ڕازیکردنی
دڵی خۆمان چاڵێکی بچووکمان
هەڵکەند و نەرمەخاکەکەیمان
گواستەوە ناو گۆڕە تازەکەی.
هەر لەو ساتەوە هەستمکرد
دایکم تێکەڵبووە بە خاك و هەرچ
کاتێکیش لەسەر زەوی ئەوەستم
و قسەئەکەم من قسە بۆ ئەو
ئەکەم.

من منداڵی بچووکی دایکم بووم.
هەرە ناخۆشترین یادەوری من
ئەو کاتە بوو کە لەگەڵ دایکم
ئەچووم بۆ کێڵگەی هەرەوەزی
تا دروێنەی گەنم بکەین. ئەو
پیاوەی پاسەوانی کێڵگەکە بوو
چەپکە گەنمە
دوراوەکانی
بەهەموو
لایەکی
کیڵگەکەدا بڵاوکردبوەوە، دایکم نەی ئەتوانی بەو قاچ و قولە
بەستراوەیەوە زوو ڕابکات. پاسەوانەکە دایکمی گرتوو زللەیەکی
پیاداکیشا. دایکم سەرسمێکیدا و بەلاداکەوت.
پاسەوانەکە دەستی بەسەر هەموو ئەو گوڵەگەنمانەدا گرت کە کۆمان
کردبوەوە و بەدەم فیکە لێدانەوە بەجێیهێشتین. من هەرگیز سیمای
ئەو ساتەی دایکمم بیرناچێتەوە کە لەسەر زەویەکە دانیشتبوو خوێن
بەدەمیدا ئەهاتە خوارەوە. ساڵانێکی زۆر دوای ئەوە، کاتێك ئەو پاسەوانە
بوو بوو بە پیرەمێردێکی قژ سپی، لە بازاڕێك لوتمان بوو بە لوتییەوە.
بیرمکردەوە لێی بچمە پێشەوە و منیش زللەیەکی پیادا بکێشم، بەڵام
دایکم توند گرتمی و بە هێمنی وتی: «ئەو پیاوەی کە لێیدام هەمان ئەم
پیرە پیاوەی ئێستا نەبوو».
من هەمیشە ناشیرین بووم. زۆر کەس لە دێ پێم پێ ئەکەنین
و تەنانەت منداڵە دڵفراوانەکانی قوتابخانەش لێیان ئەدام. کاتێك
بەگریانەوە ئەهاتمەوە ماڵەوە دایکم پێی ئەوتم: «کوڕی خۆم، تۆ
ناشیرین نیت. وەنەبێت تۆ لوتت نەبێت یان چاوت نەبێت، هەروەها تۆ
دوو دەست و دوو قاچیشت هەیە. کەواتە ناشیرینی تۆ لە کوێدایە؟ تا
ئەوکاتەی دڵێکی باشت هەبێت و زۆرینەی کات میهرەبان بیت، ئەوا تۆ
جوان ئەنوێنیت ئەگەر ناشیرینیش دیاربیت. «دواتر من چووم بۆ شار.
لەوێ خەڵکی زۆر خوێنەواری لێ بوو لە پشت ملمەوە پێم پێ ئەکەنین
یان بەئاشکرا گاڵتەیان پێ ئەکردم. لەوکاتانەدا بیرم لەو قسانەی دایکم
ئەکردەوە کە پێیوتبووم ئەو کاتانە من زۆر ئارام و هێمن بووم.
دایکم نەی ئەتوانی بخوێنێتەوە، حورمەتێکی زۆری بۆ ئەو کەسانەش
هەبوو کە خوێندەوار بوون. ئێمە لە حاڵ و بارێکی دژواردا ئەژیاین و
زۆرینەی کات تەنها نانی ڕۆژمان هەبوو بیخۆین، بەڵام ئەگەر داوای



کتێب و قەڵەمم لە دایکم بکردایە هەمیشە بۆی ئەکڕیم. دایکم ژنێکی زەحمەتکێش ئەوتۆ بوو کە ڕقی لە منداڵی تەممەڵ بوو، بەڵام ئەگەر هاتوو من لاملیم بکردایە و خۆم خەریك بکردایە بە خوێندنەوە هیچ کات سەرزەنشتی نەئەکردم.

قسەیەکی پێشینان هەیە کە ئەڵێت: «گواستنەوەی شاخێك یان ڕووبارێك ئاسانترە لە گۆڕینی سروشتی ئینسانێك». سەرباری ئەوەی دایکم و باوکم جار لەدوای جار ئامۆژگاریان ئەکردم کە هێندە فرەبێژ نەبم، من نەم ئەتوانی دەست لەو عەشقەم هەڵبگرم کەلەگەڵ لەدایکبوونمەوە هەمبوو بەرامبەر بە وشە. هەر بۆیە ناوی خۆم کرد بە «مو یان» ئەمەش جۆرە تەوسلێدانێکە لە خۆم، چونکە ئەو ناوە بە زمانی چینی واتا «قسە مەکە».





پێش ئەوەی قۆناغی خوێندنی سەرەتایی تەواوبکەم ناچاربووم واز لە قوتابخانە بهێنم چونکە منداڵێکی لەڕولاواز بووم و بەرگەی هیچ کاروبارێکم نەئەگرت بۆیە خرامە بەر مەڕلەوەڕاندن و گاوانیکردن لە دەرودەشت. کاتێك ئاژەڵەکانم ئەدایە پێش خۆم و بەلای دەرگای قوتابخانەکەمدا ئەڕۆیشتم هاوپۆلەکانی خۆمم ئەبینی لە ناو گۆڕەپانی قوتابخانەدا خەریکی ڕاکەڕاك و یاریکردن بوون، من لەویادا بێ ئەندازە هەستم بەغەمباری ئەکرد و تێئەگەیشتم کەئەبێت چەندە ئازاراوی بێت بۆ ئینسانێك ـ تەنانەت بۆ منداڵێکیش ـ کە لە گروپەکەی جیابکرێتەوە.

ئاژەڵەکانم لەو دەشت و دەرە بەرەڵائەکرد بۆ ئەوەی بەکەیفی خۆیان بلەوەڕێن. ئاسمانەکە شین بوو وەك ئەوەی نزیك بە دەریایەك بیت، لەوەڕگاکان بێ سنوور گەورەبوون و چاوت بە چاوی ئینسانێك نەئەکەوت، تەنها گوێت لە هەندێك باڵدار ئەبوو کە لەئاسماندا ئەیانخوێند. هەستم بە تانهایی و بەجێهیشتن ئەکرد، کاتێکیش دیقەتی هەورە سپییەکانیم ئەدا کە بەئاسماندا ئەڕۆیشتن چەندان وێنەی سەیر و سەمەرەی پڕ لە فەنتازیا بە خەیاڵمدا ئەهاتن و ئەچوون.

ئەو شوێنەی تیایادا ئەژیام پڕبوو لە چیرۆك لەسەر ڕێوی کە خۆی ئەگۆڕێت و ئەبێت بە ئافرەتی جوان. خەیاڵم ئەکردەوە کاتێك کە مەڕەکان ئەلەوەڕینم جوانێکی وا دێت بۆ لام، بەڵام ئەو جوانە هەرگیز نەهات. لەیەکێك لەو جارانەدا لەپڕ چاوم بە ڕێویەکی سووورباوی ئاگرین کەوت لەناو



گژوگیایەکدا قەڵەمبازیدا و هاتە دەرەوە. ئەو ڕێوییە وا ترساندمی کە نەمتوانی خۆم بەپێوە بگرم و لەجێی خۆم لەسەر قن لە ئەرزەکە دانیشتم. ڕێویەکە ڕایکرد و بێ ئەسەر دیارنەما بەڵام من دوای ئەوەش هەر گیانم ئەلەرزی. هەندێك جار بەچیچکانەوە لەلای مانگاکان دائەنیشتم و سەیری وێنەی خۆمم ئەکرد لەناو چاوە شینباو و ڕەشەکانیاندا. هەندێکجار لاسایی دەنگی باڵدارەکانم ئەکردەوە و هەوڵمئەدا لەگەڵیاندا قسەبکەم، هەندێکجار خۆم لەدرەختێك دائەگرت. بەڵام پێ ئەچوو باڵدارەکان و دارەختەکان چەند پەیامێکیان لەمنەوە پی بگات. زۆر داواتر، دوای ئەوەی بووم بە نووسەر، ئەمویست ئەو فەنتازیایانە لە ڕۆمانەکانمدا بەکاربهێنم. زۆر کەس ستایشی هێزی گێڕانەوەیان ئەکردم و هەندێك لە ئەدەب دۆستان داوایان لێ ئەکردم باسی ئەو نهێنیانەیان بۆبکەم کە چۆن ئەتوانیت مەشق بە فەنتازیای خۆت بکەیت. من تەنها زەردەیەکی خەمبارانەم بەڕوودا ئەکردن و هیچ وەڵامێکم بۆ پرسیارەکەیان نەبوو.

ئەوەی ئەبوو من بیکەم لە نووسینەکانی خۆمدا تا ڕادەیەك ئاسان بوو؛ ئەوەبوو کە چیرۆکەکانی خۆم بەشێوازی خۆم بگێڕمەوە. شێوازی خۆشم وەك شێوازی گێڕانەوەی چیرۆکنووسێك وابوو لە بازاڕ، یان هەروەکو باپیرەم و باوکی دایکم و هەموو کەسە پیرەکانی ناو دێ.

بۆ ئەوەی ڕاستگۆیانەتر قسەبکەم هەرگیز بەتایبەتی بیرم لەوە نەکردۆتەوە کە چ جۆرە گوێگرێکم هەیە. ڕەنگە ئەوەی کە گوێ ئەگرێت وەك دایکم وابێت یان کەسێك بێت وەك خۆم. سەرەتا چیرۆکەکان لەسەر خۆم و ئەزموونی خۆم



بوون.

ئینسان چەندە خاوەنی چیرۆکی زۆربێت هەمیشە سنوورێك لەبەردەمیدا هەیە، بەتایبەت ئەو کاتانەی کە چیرۆکەکانت لە بەردەم چیرۆکی ئینسانەکانی تردا ئەگێڕێتەوە. ئەو چیرۆکانەی من لە دەمی خزم و کەسەکانم یان خەڵکی دێکانی تر بیستووە، ئەو چیرۆکانەی لەلایەن باپیرانمەوە بیستوومە و ئەوانیش لە دەمی کەسە بەتەمەنەکانی پێش خۆیان بیستوویانە، هەموویان بەلێشاو وەك سوپایەکی بەپۆشتەوپەرداخ دێنەبەردەمم. ئەو چیرۆکانە بە چاوێك کە شتێکیان لێم بووێت سەیرم ئەکەن و چاوەڕوانن من بیان نووسمەوە. باپیرەم و باوکی دایکم، دایکم و باوکم، براکانم و خوشکەکەنام، پورەکانم و خاڵەکانم، ژنەکەم و کچەکەم - هەموویان لەناو نووسینەکانمدا هەن، هەروەها زۆر کەسی تری دانیشتووی گاومی لە باکوری خۆرهەڵاتی ئەو هەرێمە بوونەتە کەسایەتی ناو نۆڤلێت و ڕۆمانەکانم.

بێگومان ئەندێشەسازیم تیایاندا کردووە و بوون بە کەسێکی جیاواز لەوەی کە هەن، بوون بە کەسی ناو بەرهەمی ئەدەبی.

لە دواهەمین ڕۆمانمدا، بۆقەکان، پوری خۆمی تیایە. لەو کاتەوەی خەڵاتی نۆبڵم وەرگرتووە زۆر لە ڕۆژنامەنووسەکان بەدوایدا ئەگەڕان تا دۆزییانەوە، لە سەرەتاوە بە سەبرەوە وەڵامی پرسیارەکانی دانەوە، بەڵام هەر زوو تاقەتی نەما و ڕایکرد لە دەستیان و چووەوە بۆ ماڵەوە بۆ لای کوڕەکەی کە لە شارێکی بچوکتر ئەژی. ڕاستە کە پورم ڕۆڵی خانمێك لە ڕۆمانی بۆقەکاندا ئەبینێت، بەڵام دنیایەك جیاوازی لە نێوان کەسایەتی ڕۆمانەکە و ئەودا هەیە. پورم لە ڕۆمانەکەدا کەسێکی لەخۆبایی و ستەمکارە و تاڕادەیەك دزیشە، لەکاتێکدا پورە ڕاستەقینەکەم کەسێکی نەرم و نیان و ئاساییە، نموونەی ژن و دایکە. پورم لە تەمەنی پیریدایە و کەسێکی سەرکەوتووە و دەوڵەمەندە بە ژیان، لە کاتێکدا لە ڕۆمانەکەدا ئازارێکی ڕۆحی هەیە و شەوانێك لە بێ خەوی ئەباتەسەر و وەك خێوێکی نائارام بەناو تاریکیدا بە پاڵتاوێکی ڕەشەوە دێت و ئەچێت. من زۆر سوپاسی هەستی بەرزی پورم ئەکەم کە لێم تورە نەبووە لەبەرئەوەی بەو شێوەیە لە ڕۆمانەکەمدا باسمکردووە، من ستایشی ئەو حیکمەت و توانایەی ئەکەم کە لەو حاڵەتە ئاڵۆزەی نێوان کەسایەتی ڕۆمان و کەسی ڕاستەقینە گەیشتووە.



کاتێك دایکم مرد غەرقی دڵگرانی بووم و بڕیارمدا کتێبێك بنووسم و پێشکەشی بکەم. ئەوەش کتێبی «سمتی زل و مەمکی گەورە» بوو. لەبەرئەوەی کە من تەواو بڕیارمدابوو پڕپیشبووم لە هەست و سۆز ڕۆمانیکی گەورە کە بریتیبوو لە پێنج هەزار هێما لە ماوەی ٨٣ ڕۆژدا نووسیم.

لە «سمتی زل و مەمکی گەورە»دا بێ ویژدانانە باسی ئەزموونی دایکمم کردووە، بەڵام ئەزموونی ئەو دایکەی ناو ڕۆمانەکە لە ئەزموونی زۆر دایکی تری گاومی باکوری خۆرهەڵاتەوە هێنراوە و شاعیرێنراوە.

لەسەرەتاوە ڕۆمانەکەم پێشکەشی «ڕۆحی دایکم کرد لە ئاسمان» بەڵام ڕۆمانەکەم بەهەمان گەرمییەوە پێشکەش بە هەموو دایکانی دنیاش کردووە. بەهەرحاڵێك ئەوە نیەتی ئەو جورئەتکردنەی من بوو، تەواو وەك ئەوەی کە تەمەنام ئەکرد گاومی باکوری خۆرهەڵات بکەمە بچوکراوەی چین یاخود بیکەمە وێنەیەکی بچوکی دنیا.

دوای ئەوەی خەڵاتی نۆبڵم لە ئەدەبدا وەرگرت هەندێك گفتوگۆ هاتنە ئاراوە. لەسەرەتاوە پێموابوو ئەم هەرایە لەسەر منە، بەڵام وردە وردە تێبینیم کرد کە قسە لەسەر کەسێکی تر ئەکرێت کە هیچ پەیوەندی بە منەوە نییە. وام هەست ئەکرد چومەتە ناو شانۆگەرییەکەوە و سەیری ئەکتەرێك ئەکەم. ئەمبینی کە چۆن گوڵ بەسەر خەلاتکراوەکەدا هەڵئەدەن، بەڵام ئەو بەردانەشم ئەبینی کە چۆن ئەگیرێنە دەمی و چۆن پیساوی زێرابیش ئەکەن بەسەریدا. ترسام تەحەمولی نەمێنێت، بەڵام ئەو بەزەردەخەنەوە لەناو ئەو گوڵ و بەرد تێگرتنەدا سەیری ئەملاولای خۆی ئەکرد، ئەو ئاوە پیسەی کە بەسەر جەستەیەوە بوو سڕی و هەنگاوێك چووە ئەولاوە و بەو کۆمەڵە خەڵکەی وت:

باشترین شتێك بۆ نووسەر ئەوەیە بنووسێت هێندەی ئەوەی قسەبکات. هەموو ئەو شتانەی ئەیانڵێم لەناو نووسینەکانمدا هەن. ئەو پیتەی لەدەم دێتە دەرێ پەرشوبڵاوئەبێتەوە و با ئەیبات، بەڵام ئەوەی لەسەر وەرەقە ئەنووسرێت هەمیشە ئەمێنێتەوە. تەمەنا ئەکەم ئێوە سەبرتان هەبێت و کتێبەکانم بخوێننەوە ئەگەرچی من هەقی ئەوەم نییە ئەم داوایەتان لێ بکەم. من هیچ ئومێدێکی ئەوتۆم نییە ئێوە بگۆڕم تەنها لەبەر ئەوەی ئەو کتێبانە ئەخوێننەوە، چونکە هیچ نووسەرێك لە دنیادا نییە هەموو خوێنەران دڵخۆشبکات. باشتربوو ئەم قسەیەم لە ئێستادا بکەم نەك دوایی.

ئەگەرچی من زۆر تاقەتیشم نییە قسەبکەم بەڵام ئەبێت ئەمڕۆ ئەمە بڵێم، بۆیە ڕێم بدەن هەندێك قسەی تر بکەم. من کەسێکی چیرۆك گێڕەرەوەم، چیرۆکێکتان بۆ ئەگێڕمەوە:



پێش نزیکەی سی ساڵێك لەووبەر لە سوپادا کارم ئەکرد. ئێوارەیەکیان لە نووسینگە دانیشتبووم و ئەمخوێندەوە ئەفسەرێکی پیر لە دەرگاوە خۆی کرد بە ژووردا، بەرامبەرم وەستا و سەیرێکی شوێنەکەی کرد و منگەمنگێکی کرد و وتی: «بەڕاست، خۆ کەسی لێ نییە؟» لەپڕ هەستامە سەرپێ و وتم: «من بە کەس حساب ناکرێم؟».
ئەفسەرە پیرەکە تا بناگوێی سوور هەڵگەڕا و پاشەوپاش گەڕایەوە. بۆ ماوەیەکی زۆر لەخۆم ڕازیبووم چونکە وەك سەربازێکی ئازا خۆم ئەهاتەبەرچاو، بەڵام ئەمە گەر لە کاتێکی تردا ڕویبدایە ڕەنگە هەستم بەشەرم بکردایە
.
من چیرۆکنووسم.
من بۆیە خەڵاتی نۆبڵم پێبەخشرا چونکە چیرۆك ئەگێڕمەوە.
لەوکاتەوەی خەڵاتەکەم پێ بەخشراوە زۆر ڕوداوی خۆش ڕوویانداوە، ئەو ڕووداوانەش قەناعەتیان پێکردووم کە ڕاستی و یەکسانی بوونیان هەیە.
من لەو ساڵ و مانگانەی کە لەبەردەممدا ماون
بەردەوام ئەبم لە گێڕانەوەی چیرۆکەکانم.
سوپاس

سەرچاوەکان:
www.Dn.se
www.SvD.se
www.nyheterna.net






# ئەو کچە شازادەیەی
# کە جادوبازێکی کێونشین یاری بوو

**و. لە سویدییەوە: سێوە**

هەبوو نەبوو پیاوێك هەبوو کوڕێکی هەبوو ناوی پێتەر بوو. پێتەر لە ڕۆژێکی خۆشدا چوو بۆ لای باوکی و داوای ئەو پارەیەی لێکرد کە بە میراتی بۆی مابووەوە، پارەکە نزیکەی بیست دالەر ئەبوو. کاتێك پێتەر پارەکەی لەباوکی وەرگرت کەوتە گەڕان بەناو دنیای پان و بەریندا. بەڵام لێرەدا ئەبێت ئەوە بزانن کە ئەم گەنجە کەسێکی تا بڵێی بەڕەحم و دڵگەرم بوو، خاوەن هەستێکی بەهێز بوو لەبەرامبەر ئەوەی کامە چاکەیە و کامە خراپە، هەر بۆیە هەمیشە ئامادەبوو بۆ کۆمەك کردنی هەرچ کەسێك کە پێویستی بەیارمەتی ئەو بێت.
لەیەکێك لە ڕۆژەکانی گەشتەکەیدا بەلای دێیەکدا تێپەڕی، لەویادا چاوی بەتەرمێك کەوت کە لە ناوەڕاستی مەیدانێکدا بەجێهێڵرابوو. کەمێك لەولای ئەوەوە جوتیارێك سەرقاڵی کێڵانی کێڵگەکەی بوو. پێتەر لێی چووە پێشەوە و پرسیاری ئەوەی لێکرد کە بۆچی ئەو تەرمە نانێژن. جوتیارەکە لە وەڵامدا وتی: ئەوە تەرمی پیاوێکی هەژارە و خەڵکی دێ نایانەوێ هیچ پارەیەك بۆ ناشتنی مردوویەك سەرفبکەن کە بخرێتە چاڵێکەوە، بۆیە لەویادا هەرئاوا بەجێیانهێشتووە. لە ڕوویەکیشەوە باشە چونکە بەو زووانە ڕێوی و قەلەڕەشکەکان دێن و تێر لەلاشەکەی ئەخۆن و هێندە نابات هیچی لێ نامێنێتەوە و بەیەکجاری ڕزگارمان ئەبێت لە دەستی.
ئەم وەڵامە ئەزیەتی دڵی پێتەری دا، لە جوتیارەکەی پرسی کە ئایە ئەبێت ناشتنێکی شەرەفمەندانە چەندی تێبچێت.
ـ ئا، ئەوەندەی من بزانم تەنها بیست دالەری تێئەچێت.



پیتەر
چوو
بۆ لای گەورەی دێکە
و بیست دالەرەکەی خستە دەستیەوە و
داوای لێکرد ئەو کەسە گوناهـ و مردووەی
سەر شەقامەکە بنێژێت. خۆشی لەگەڵیان
مایەوە تا ئەو کاتەی لە ناشتنەکە بوونەوە،
دواتر بەجێیهێشتن و کەوتەوە گەشتکردن.
پێتەر پێڕانەگەیشتبوو هێندە لە دێکە
دووربکەوێتەوە پیاوێك بە ڕاکردن دوای
کەوت و پێیووت زۆر خۆشحاڵ ئەبێت
گەر ئەو ڕێگەی بدات ببێتە هاوسەفەری.

پێتەریش دژی ئەم داوایەی نەبوو، چونکە
پیاوەکە کەسێکی ڕێکپۆش و بەڕواڵەت
ڕووخۆش بوو، بۆیە بە خۆشحاڵییەوە
ڕێگایدا ببێتە هاودەمی سەفەرەکەی. ڕۆژ
بە ڕۆژ تائەهات پێتەر ئەم پیاوەی زیاتر
خۆشئەویست و دڵخۆشبوو بەوەی هاوسەفەرێکی
ئاوهای لەگەڵدایە. وورده وورده پێکەوە چەندان
هەفتەیان بەڕێکرد، ئەم نزیکبوونەوەیە بووە
هۆی ئەوەی هەرچیان هەیە و نییە لە دڵی
خۆیاندا بۆ یەکتری بگێڕنەوە.
هەرئاوا پێکەوە ڕۆیشتن
تا گەیشتنە شارێکی
گەورە، هەموو خەڵکی
ئەم شارە ڕەشپۆشبوون،
تانانەت سەر کۆشکەکی
ئەم شارەش ئاڵایەکی لارەوەبووی
ڕەشی پێوە هەڵواسرابوو.
پێتەر لەیەکێك لەو ڕێبوارانەی کە
بەلایاندا تێپەڕی پرسیاری لێکرد
و لەوەڵامدا بۆی دەرکەوت کە
کچە جوان و خۆشەویست
و نازدارەکەی پاشا
لەلایەن جادوبازێکی پیر
و ترسناکی کێونشینەوە



جادوی لێکراوە، بەجۆرێك ئەوتۆ شازادەکەی ناچارکردووە شەوانەش سەردانی بکات. شازادە بەرۆژ هێندە بێدەنگە وەك ئەوەی چووبێتە خەوێکی قورسەوە، بەڵام هەندێك جاریش لەپڕ بەلەسە و شێت ئەبێت و ئەکەوێتە شکاندنی هەرچییەك بێتە سەر ڕێگای.
لەبەرئەوەی شازادە زۆر شۆخ و شەنگە و سەرباری ئەوەش میراتگری هەموو موڵك و سامانی مەملەکەتەکەیە، زۆر کوڕی گەنج چوون بۆ کۆشك تا ڕزگاری بکەن، بەڵام هیچ کام لەو کوڕە گەنجانە فریای باسکردنی هاوسەرگیری نەکەوتبوون لەگەڵ شازادەدا چونکە کەسیان نەیانتوانیبوو ئەو جادووە بەتاڵ بکەنەوە کە شازادە دووچاری بووبوو. هەر کەسێکیش ویستبێتی شازادە لەو جادووە ڕزگاربکات دەمودەست وەك بەچکە پشیلەیەك مردووە. هەرچ ڕزگارکەرێکیش هاتۆتە پێشەوە پێویستبووە وەڵامی ئەو ڕازە بداتەوە کە لە دڵی شازادەدابووە، بەڵام ئەوەی جێی نیگەرانی بوو تا ئەوکاتە هیچ ئینسانێکی ئاسایی نەیتوانیبوو لەوەدا سەرکەوتووبێت. لەگەڵ شکستهێنانی هەر ڕزگارکەرێك بۆ درکاندنی ڕازی دڵی شازادە، دەستکراوە بە ژماردنی ئەو ڕۆژە کەمانەی کە لە ژیانی ئەو ڕزگارکەرەدا ماوە. زۆر کوڕە شازادەی بە شان و شەوکەت هەوڵیاندا بەڵام هیچیان نەیانتوانی لەو کارەدا سەرکەوتووبن، زۆر کوڕی گەنجی تریش هاتنەپێشەوە بەڵام هەموویان ژیانیان لەو پێناوەدا دانا، بۆ نموونە هەردوو کوڕی میر و بارونیش لەناو ئەو کوڕانەدا بوون. لەو ساڵانەی بەرووددا کەسێك نەمابوو جورئەتی چوونە پێشەوە بکات، بەڵام سەرباری ئەوەش هەر ئاخ بوو بۆ شازادە هەڵ ئەکێشرا کە ڕۆژانێك چەندە شۆخ و شەنگ و نازداربووە! ئەو قسەیە ڕاستە ـ بەڵام هێشتاش شازادە هاوتای نەبوو لە جوانیدا.
پێتەر بە هاوڕێکەی وت:
ـ ئەی ئەگەر هاتوو من ئەو کارە بکەم و سەرکەوتووبم! تۆ پێت وایە دەرفەتێك مابێت بۆ سەرکەوتن، لەکاتێکدا خەڵکانێکی زۆر پێش من شکستیان هێناوە؟
ئەگەر من لەم پێناوەشدا بمرم، ئەوا لە پێناوی شتێکی باشدا ئەمرم،
ئەگەر سەرکەوتووش بووم ئەوا هێندەی ئەو دەستکەوتە گەورەنابێت کە من و تۆ تێیدا بووین بە هاوڕێ!
هاوسەفەرەکەی پێتەریش وەڵامی دایەوە:



ـ من پێموایە تۆ ئەبێت ئەم هەوڵەبدەیت، پەیمانبێت منیش یارمەتیت بدەم، ئەشمەوێت تۆ تێبگەیت کە من توانایەکی زیاترم لە خەڵکی تر هەیە، ئەوەش بزانە کە من ئینسانێکی ئاسایی نیم، بەڵکە من تارمایم، گەر لەبیرت بێت ئەو پیاوەی لە دێکەدا ناشتت، من تارمایی ئەو پیاوەم، من خاوەنی ئەو توانا و زانیاریانەم کە تۆ لە ئێستادا پێویستت پێیانە بۆ بەئەنجام گەیاندنی ئەم کارە! تەنها بڕۆ بۆ لای پاشا و پێی بڵێ کە تۆ ئەتەوێت هەوڵبدەیت شازادە لەو داوی جادووە ڕزگاربکەیت. پاشاش بەمە زۆر خۆشحاڵ ئەبێت، ئەگەر هاتو سەرکەوتووشبوویت ئەوا خەڵاتێکی زۆر باشت ئەکات.
پێتەر ملی ڕێی کۆشکی گرت، ناوی خۆی وەك ڕزگارکەرێك نووسی و چووە بەردەمی پاشا. کاتێك باسی ئەوەی کرد کە بە ئومێدی چییە بیکات، پاشا پێیووت:
ـ ئەی لاوە خۆشەویستەکەم، ئەم کارەی تۆ هاتویت بیکەیت ئێجگار دژوارە. بیر لەوە بکەرەوە ئەگەر هاتوو تۆ نەتوانی کچەکەم ڕزگاربکەیت ئەوا ئەبێت ژیانی خۆتی لەسەر دابنێیت. ئەگەر نەوتوانی ڕازەی ناو دڵی ئەو بزانیت ئەوا بێ هیچ چەندوچوونێك ئەتکوژێت.
پێتەر ووتی:
ـ ئەکرێت ئەوە ڕووبدات، بەڵام هەرچۆنێك بێت من ئەمەوێت هەوڵبدەم، دواتریش چی ئەبێت با ببێت!
پاشاش وتی:
ـ کەواتە بەیانی زوو وەرەوە. ئەم ماوەیە منیش باسی تۆ بۆ کچەکەم ئەکەم.
پیتەر گەڕایەوە بۆ ئەو میوانخانەیەی کە گرتبویان و هاوڕێکەی لەوێ چاوەڕوانی ئەکرد. کاتێك پێتەر بۆ هاوڕێکەی گیڕایەوە پاشا چی پێوتووە، هاورێکەی وتی:
ـ با بوەستیت تا ڕۆژ ئاوائەبێت، کاتێکیش تاریك بوو کاتژمێر بوو بە نزیکەی دەی شەو ئەوکات قسەی لێ ئەکەین. بەڵام ئەم نهێنییە لای هیچ کەس مەدرکێنە و باسی پلانەکان مەکە، هەوڵیش بدە کەیف سازبیت! من زۆر دڵنیام تۆ شازادە ڕزگارئەکەیت و تۆش ئەبیت بەیەکێك لەوان!
شتەکان تا ئەو کاتە بەو شێوەیە ڕۆیشتن، بە جووت پێکەوە چوونە درەوە و ڕێکەوتی هەموو ئەو شتە سەیروسەمەرانەی ناو شاریان کرد. هەروەها هەردووکیشان چاویان گێڕا بۆ ئەوەی بزانن جێگای کچە شازادە لە کوێدایە و پەنجەرەی ژووری نووستنەکەی کەوتۆتە کوێوە. کاتێك زانیان کە چیان پێویستە گەڕانەوە بۆ میوانخانەکە، نانی ئێوارەیان خوارد و قسەوباسیان لە هەموو شتێك کرد تا



کاتژمێر بوو بە دەی شەو. گەڕانەوە بۆ ژوورەکەی خۆیان و هاورێکەی پێتەر قتویەك مەڵحەمی لەبەرد دروستکراو و دوو باڵی لە شاپەڕ دروستکراوی لە تورەکەیەك دەرهێنا لەگەڵ قامچییەکی ئاسندا.
پێتەر جلەکانی داکەند و هاورێکەی شانەکانی بە مەڵحەمەکەی ناو بەردە هەڵکۆڵراوەکە چەورکرد و هەردوو باڵەکەی لە پشتی بەست. دواتر پێیووت:
ـ ئێستا بڕۆ بفرە بۆ بەردەم پەنجەرەی ژووری نووستنەکەی شازادە، لەویادا بوەستە و چاوەڕێ بکە، بەڵام ئەبێت ئاگاداربیت هەرچ کاتێك هاتە دەرەوە و فڕی تۆ ئەبێت خێرا دوای بکەویت، لەکاتی فڕیندا ئەبێت تۆ بەم قامچییەی دەستت بەباشی بکێشیت بەپشت و سەر و قاچیا. ئەو بۆ هەرکوێیەك فڕی تۆش بفڕە، قاچت لەگەڵ قاچیدابێت کاتێك ئەچێتە ژوورەوە! خۆت بشارەوە و گوێبگرە بزانە جادوبازە کێونشینەکە چی ئەڵێت! شازادە لەویادا باسی تۆ بۆ ئەو ئەکات و لێی ئەپرسێت کە چ ڕازێك بخاتە دڵییەوە تا دواتر لە تۆ بپرسێت. وەك مشکێك لە جێگەکەی خۆتدا بێ جوڵە بوەستە و زۆر بە وردی گوێ بۆ هەموو شتێك بگرە.
کاتێك هاورێکەی باڵەکانی بەباشی لە پشتی پێتەر توندکرد پەنجەرەکەی بۆ کردەوە و پێی ووت:
ـ هەر وەك چۆن لەم سەرەوە دوای شازادە ئەکەویت ئاواش لەگەڕانەوەدا بەدوایەوە ئەبیت، ئەوەندەی فریاش ئەکەویت قامچی پیائەکێشیت تا دیسانەوە ئەگاتەوە بەردەم پەنجەرەی ژوورەکەی و ئەفڕێتەوە ژوورەوە.
پێتەر قامچییەکەی گرت بەدەستیەوە، سەری بەرزکردەوە و خۆی فڕێدایە بۆشایی ئاسمانەوە، بە سەر سەربانەکانی ماڵەکاندا فڕی تا گەیشتە کۆشك و بەردەم پەنجەرەی ژووری نووستنەکەی شازادە. پێتەر لەبەردەم پەنجەرەکەدا وەستا، سەیری ژوورەوەی کرد و چاوی بە شازادە کەوت کە ئەویش دوو باڵی هەبوو. بێ پەروا بە ژوورەکەدا ئەهات و ئەچوو، وەك ئەوەی لەو دەمودەستەدا عەقڵی خۆی لەدەستدابێت، ئەیقیژاند و هاواری ئەکرد. پێتەر لەبەر پەنجەرەکەدا وەستا و چاوەڕوانی شازادەی کرد تا بێتەدەرەوە. کاتێك کاتژمێر بوو بە یانزەی تەواو شازادە پەنجەرەکەی کردەوە و دەمودەست کەوتە فڕین. پێتەریش خۆی هەڵدا و دوایکەوت، کاتێك لێی نزیکی بوەوە زۆر بە ترسەوە بە



قامچییە ئاسنینەکە دەستی
کرد بە قامچی کێشان پیایدا،
بەجۆرێك کە ئیتر ڕۆحی پیتەر
پڕبوو لە ئازار. بەڵام ئەم
ئازارە هیچ دادێکی نەئەدا
ـ ئەو ئەبوو هاوڕێکەی چی
پێ وتبوو وابکات ئەگەرچی
هەموو ئەو شتانەی کە
ئەیکرد ژانی ئەگەیاند بە
دڵی.
وورده وورده لە کێوێك نزیك
ئەبوونەوە، دەمی شاخێکی
گەورە لەبەردەمیاندا کرایەوە
و ئەوانیش بەو نێوانەدا فڕین
و چوونە ژوورەوە.
ـ ئێستا کاتی ئەوەیە ئاگام لە خۆمبێت، پێتەر
وای بە خۆی وت و بەبێ دەنگی بەدوای شازادەدا
ڕۆیشت و چووە هۆڵێکی گەورەوە. نزیك بە دەرگای
هۆڵەکە مێزێکی گەورە دانرابوو، پێتەر
چووە پشتی مێزەکەوە و خۆی شاردەوە
بۆ ئەوەی بتوانێت گوێ لە هەموو ئەو
قسانە بگرێت کە لەویادا ئەکرێن،
هەروەها ئاسانیش بێت بۆ
چوونە دەرەوە لە کاتێکدا



ئەگەر شتێك
ڕوویدا، یاخود ئەو کاتەی کە ئەگەڕێتەوە بتوانێت
بە ئەسپایی دوای شازادە بکەوێتەوە و دیسانەوە
بگەڕێتەوە شوێنی خۆی.
کچە شازادەکە ڕایکرد بۆ لای جادوبازە کێونشینەکە
و خۆی هەڵدایە باوەشی. جادوبازێکی پیر و ترسناك
بوو، قژی درێژ و سپی و ئاڵۆسکاو بوو. لەو تاریکیەدا
چاوە سوورەکانی وەك چاوی سەگی شوێن هەڵگر
ئەبریسکانەوە. ڕوواڵەتێکی ستەمکارانە و ناحەزی
ئەوتۆی هەبوو وایکرد پێتەر تەواو بترسێت و



پەشیمانبێتەوە لەوەی چی
بەسەر خۆی هێناوە. بیریشی
لەوە ئەکردەوە کە ئەبێت
ئاخۆ کچە شازادەیەکی جوانی
ئاوا لە لای ئەم پیرە قێزەونە
چی بکات؟
پێتەر هەستیکرد کەوتۆتە
ناو تەڵەیەکەوە. نەی ئەوێرِ
لە ترسا جوڵەیەك چییە بیکات
نەبادا پێیبزانن، ئەو دەرگایەی
لە شاخەکەشدا کرابووەوە و
ئەوانی لێوە هاتبوونە ژوورەوە
داخرابووەوە و بووبوو بە کەرتە
شاخێکی تەواو. دوای نازکردنی
جادوبازەکە و شازادە لەگەڵ
یەکتریدا، جادوبازە کێونشینەکە بە شازادەی وت:
ـ تۆ چەند مانگێکە نەهاتوویت بۆ لام، ئەمەش مانای ئەوەیە ماوەیەکی زۆر درێژە تۆ کەست نەکوشتووە.
چەند گوناهیت، لەو کاتەوە لەزەتت لە خواردنەوەی خوێنی ڕزگارکەرێك نەبینیوە. بەڵام مادام تۆ ئێستا
لێرەیت نیشانەی ئەوەیە کە چۆلەکەیەك بووە بە داوەکەوە.
ـ وایە، کچەکە وەڵامی دایەوە، ئێستا پیاوێکی تر هاتۆتە پێشەوە، بەڵام ئەو پیاوە تەنها پیاوێکی ئاساییە،
نە شازادەیە و نە میر و نە بەگزادە. بەڵام جادوبازە خۆشەویست و نازدارەکەم، تۆ ئەزانیت چ کەش و
هەوایەکی ترسناکی هەیە ئەمشەو، من بەناو زریاندا فڕیم تا گەیشتمە ئێرە، سەیرمکە لە ڕێگادا بۆ
لای تۆ چەند خراپم بەسەرهاتووە ـ شازادە جێ شوێنی برینەکانی سەر پشتی پیشاندا کە خوێنیان پیادا
ئەچۆڕا.

ـ ئۆی، جادوبازە کێونشینەکە وتی، بەڵام هێندەش ترسناك نییە! کەواتە هەقی ئەم برینانەی خۆت لەو کەسە ڕزگار کەرە بکەرەوە کە هاتۆتەپێشەوە. بیر لەوە بکەرەوە تا خوێنی زیاتری لێ بێنیت ئەوا خوێنی زیاتر ئەخۆیتەوە و زیاتر ئەبیتە یاری جوان و بێ هاوتای من.

ـ هەروایە، ڕۆژی مردنی ئەو ڕۆژی چاکبوونەوەی منە! بەڵام تۆ ئەبێت هەر ئێستا یارمەتیم بدەیت بۆ دۆزینەوەی ڕازێکی تر بۆ ئەم کەسە ڕزگارکەرە. ئەم جارە بیر لە چی بکەمەوە؟

جادوبازەکە وەڵامی دایەوە و وتی:

ـ بیر لە ئەسپە سپیەکەی باوکت بکەرەوە کە ئەیبات بۆ شەڕ.

ـ باشە، زۆر باشە، شازادەکە چەند جارێك ئەمەی بەدەم خۆیەوە وتەوە و داوای لێکرد ڕێگای بدات جاریکی تر بگەڕێتەوە.

ـ کاتژمێر چارەکی ئەوێت بۆ دوانزەی شەو، ڕێگایەکی دووری فڕینم لەپێشە، خۆشت ئەزانیت ئەبێت من پێش کاتژمێری دوانزە گەڕابێتمەوە بۆ ماڵەوە!

جادوبازە کێونشینەکە دەرگا شاخاویەکەی کردەوە، کچەکە کەوتە ڕێ و پێتەریش بەدوایدا فڕی، بە فرسەتیشی زانی لە ڕێگای گەڕانەوە بە قامچییە ئاسنیەکەی بەهەموو شوێنێکی جەستەی شازادەدا بکێشێت. کاتێکیش نزیکبوونەوە لە کۆشك شازادە لە پەنجەرەی ژووری نوستنەکەیەوە فڕی





و خۆی گەیاندەوە ژوورەوە، پێتەریش دوای قەیریك چاوەڕوانکردن بەرەو میوانخانەکە دای لە شەقەی باڵ و گەڕایەوە. دوای ئەوەی باڵەکانی بەوریاییەوە لە پشتی کردەوە بۆ ئەوەی لە ژوورەکەدا پاڵکەوێت. هاورێکەشی چووبووە شیرن خەوەوە و پرخەی ئەهات، بە پێتەری وتبوو ئەبێت زۆر ئاگاداری باڵەکانی بێت، ئەویش سۆزی پێدابوو کە تەنها پەڕێك چییە لە باڵەکانی نەکاتەوە کاتێك ئەیانخاتەوە ناو تورەکەکەی.

بەیانی ڕۆژی دواتر پێتەر لەخەوهەستا و باشترین جلی خۆی لەبەرکرد، نانی بەیانی لەگەڵ هاورێکەی خوارد و دواتر چوو بۆ کۆشك. لەوێ ڕێگایان پێدا بچێتە ژوورەوە، شازادە لەسەر تاکە قەنەفەیەکی کەشخەی ئەو موبیلانە دانیشتبوو کە ژوورەکەی پێ ڕازێنرابووەوە، شازادە تاڕادەیەکیش غەمگین دیاربوو. بەڵام جوان بوو! چاوەکانی میهرەبان و دلارابوون، هێندەش بەتەمەن گەورە نەبوو بەڵام جەستەیەکی قەشەنگ و ناسکی هەبوو ـ مەحاڵبوو لە سیمایدا ببینیت کە ئەم کەسە چەندان کەسی کوشتووە ـ هێندەش کەمی نەکردبوو پێشتر نۆ کەسی کوشتبوو تەمەناشی ئەکرد بە پێتەرەوە کە

ئێستا لەبەردەمیدا وەستاوە ژمارەکە بگەیەنێتە دە. کاتێك پێتەر سڵاوی کرد شازادە بەرەوپیری چوو، بە دەنگێکی حەیران و لەدڵەوەهاتووەوە پێیووت:

ـ ئاوها، ئەمە تۆیت کە ئەتەوێت من ڕزگار بکەیت. تەمەنا ئەکەم ئەوە بزانیت گەر هاتو تۆ ئەو ڕازەی ناو دڵی منت نەزانی چییە ئەوا ژیانی خۆت لەدەست ئەدەیت.

ـ بەڵێ ئەزانم، پێتەر وەڵامی دایەوە، بەڵام سەرباری ئەوەش ئەمەوێت هەوڵی خۆم بدەم، ئەگەر سەرکەوتووش نەبووم بەخۆشحاڵییەوە با لە پێناوی تۆدا بمرم. چونکە تۆ لە هەموو ڕوویەکەوە جوان و شیرینیت، بەخۆشحاڵییەوە لەپێناوی ڕزگارکردنی تۆدا بەرەو ڕووی هەموو ئازاری مردنێك ئەچم. ئێستا ڕێمبدە با گوێم لەو ڕازەبێت کە لە دڵتا حەشارتداوە!

ـ هەر ئاوها، شازادەکە وتی، لەویادا دیاربوو شازادە بۆ حاڵی ئەو تەواو دڵگران و چاوبەفرمێسك بوو. من تەواو دڵگرانم بۆت، بەڵام لەبەرئەوەی تۆ کوڕێکی کەللەڕەقیت کەوایە ئێستا گوێبگرە. پێمبڵێ من بیر لە چی ئەکەمەوە!

پێتەر ووتی:

ـ ئەمە ئەوەندە قورس نییە. من دڵنیام شازادە ئێستا بیر لە ئەسپە سپیەکەی باوکی ئەکاتەوە کە ئەیبات بۆ جەنگ. ئایە وانییە؟

شازادە تەواو ڕەنگی سپی هەڵگەڕا و وتی:

ـ تۆ تەواو زانیت چییە! ڕەنگە دواتریش لە پرسیارەکانی تردا بەخت یاوەرت بێت. بەیانی زوو سەرلەنوێ وەرەوە بۆ لام، ئەوەش بزانە گەر هاتوو توانیت ڕزگارم بکەیت ئەوا پاداشتەکەت گەورە ئەبێت!

پێتەر بەئەدەبەوە دانەوییەوە و ئەوێی بەجێهێشت.

پێتەر سەرلەبەری ئەو ڕۆژەی لەگەڵ هاوڕێی سەفەرەکەیدا بردە سەر، شەوێش وەك شەوی پێشوتر هەمان شت ڕوویدایەوە، بەڵام ئەوەی جیاوازبوو لە دوێنێ شەو ئەوەبوو پێتەر دوو قامچی ئاسنینی وەرگرت، هەر قامچیەك و لەدەستێکیدا، بۆ ئەوەی لەکاتی فڕیندا بە هەردوو قامچییەکان بکێشێت بە شازادەدا. بەڵام کاتێك نزیکی شاخەکەبوونەوە بەراورد بە



شەوی ڕابردوو پێتەر ڕووناکییەکی زۆرتری لە هۆڵە گەورەکەی جادوبازەکەدا بینی. چونکە مانگ بەسەر شاخەکەوە وەستابوو هەرچی تریفەی ساردیشی بوو ڕژاندبوویە ناو هۆڵەکەوە.
لەسەر مێزەکە ماسیەکی گەورە دانرابوو دڕکێکی گەورەی پێوەبوو. شەویی رابردوو تەنها ئەستێرەکان بەسەر شاخەکەوە ئەبریسکانەوە، سەر مێزەکەش هیچی لێ نەبوو.
کاتێك شازادە فڕییە هۆڵەکەوە و پێتەریش لە دوایەوە چووە ژوورەوە دەرگا شاخاوییەکە لە دوایانەوە سەرلەنوێ داخرایەوە، جادوبازە کێونشینەکە لەسەر کورسیەکی تەخت نشین دانیشتبوو، شازادە چووە پێشەوە و لەبەردەمیدا کەوتە سەرچۆك، باسی ئەوی بۆ کرد کە ئەو پیاوەی هاتووە ڕزگاری بکات بەو ڕازەی زانیوە کە ئەو لە دڵی خۆیدا هەڵیگرتووە. شازادە لە جادوبازە کێونشینەکەی پرسی:

ـ ئێستا ئێمە چی بکەین؟

ـ ئم، جادوبازەکە وتی، دیارە هێزێك هەیە تەنانەت لێرەدا لەناو ئەم کێوەی خۆشمدا دژایەتیمان ئەکات. بەڵام ئەم جارەیان نابێت ئەم گەنجە چەتوونە سەرکوتووبێت لە وەڵامدانەوەی پرسیارەکەتدا، ئەم جارەیان بیر لە شمشێرە گەورەکەی باوکت بکەرەوە.

ـ باشە، شازادە وتی. بەڵام ئەوەش بزانە کە ئەم شەویش بە درێژایی ڕێگا بە قامچی پیایداکێشاوم، ئەمجارەیان لە دوێنێ شەو زۆر خراپترم بەسەرهاتووە. بڕوانە خوێنم لێدێت! بەڵام سوێندت بۆ ئەخۆم، ئەگەر هاتوو بەیانی نەیتوانی وەڵامی پرسیارەکەم بداتەوە، ئەوا دڵنیابە هەر لەویادا بە شمشێرەکەی باوکم کە بیری لێ ئەکەمەوە ژیانی ئەو گەنجە نەفامە لەناوئەبەم. شازادە ئەمەی وت و خۆی هەڵدایە باوەشی جادوبازە کێونشینەکە. جادوجازەکەش بە ئارامی پێیووت:

ـ شازادە خنجیلانەکەم ئێستا کاتی ئەوە هاتووە بگەڕێیتەوە بۆ ماڵەوە. باش ئاگات لەخۆتبێت و ئەشیبینیت کە ئەم ڕزگارکەرە ئەوە ئەچێژێت کە شایستەیەتی. بەڵام ئەم ڕازەی دڵی خۆت بۆ هیچ بوونەوەرێك مەدرکێنە، دەنا بەیانیش هەمان شتی خراپ دووبارە ئەبێتەوە!

شازادە بەهەمان ڕێگای خۆیدا فڕییەوە و پێتەریش بەدوایەوە ـ بەدووری ڕێگاش قامچی خوارد تا خۆی ڕزگارکرد و فڕییە ناو پەنجەرەی ژوورەکەیەوە. پێتەریش دواتر بەرەو میوانخانەکە فڕییەوە، باڵەکانی داکەند، خستنیەوە ناو تورەکەی هاوڕێکەی و ڕاکشا و نووست. ئەمەش نیشانەی ئەوە بوو کە پێتەر زیاتر لە شازادە کە لەوکاتەدا لەناو ژوورەکەی خۆیدا بوو هەستی بە ئازایەتی ئەکرد.







بەیانی زووی ڕۆژی دواتر پێتەر کەوتەوە سەرقاچ و چوو بۆ کۆشك، لەوێ شازادە وەك ڕۆژی پێشووتر بەرێزەوە پیشوازی لێکرد. شمشێرە گەورە بە خوێن پەڵەبووەکەی باوکی لەسەر مێزێکی هۆڵەکە دانرابوو. هەر لەگەڵ چوونە ژوورەوەی پێتەر خێرا شازادە لێی پرسی:

ـ من بیر لە چی ئەکەمەوە؟

پێتەریش بەهەمان خێرایی ئەو وەڵامی دایەوە:

ـ ئەی خانمی بەخشندە، تۆ بیر لە شمشێرەکەی باوکت ئەکەیتەوە!

لەویادا شازادە کەوتە سەر قەنەفەکەی و بە زمانی گیراوەوە وتی:

ـ خوای گەورە، من ناپاکم!

بەڵام هەر خێرا خۆی کۆکردەوە و بەردەوام بوو:

ـ سبەینێ سەرلەبەیانی وەرەوە. ئەگەر جارێکی تر بەخت یارت بوو ئەوا نیشانەی ئەوەیە تۆ سەرکوتووبویت!

دوای ئەوە پێتەر گەڕایەوە بۆ میوانخانەکە و چی ڕوویدابوو بۆ هاوڕێکەی گێڕایەوە کە چۆن بۆ جاری دووهەمیش سەرکەوتووبووە. دواتر هەردووکیان تا تاریك داهات ڕۆژێکی خۆشیان لە شارەکە پێکەوە بردە سەر، گەڕانەوە بۆ میوانخانەکە و نانێکی خۆشیان پێکەوە خوارد. نزیك بە سەعات دەی شەو پێتەر خۆی ئامادەکرد بۆ جاری سێهەم بچێتەوە ـ بەو ئومێدەی ئەم جارەیان دواهەمین جاربێت بچێت بۆ شاخی جادوبازە کێونشینەکە.

هاوڕێکەی پێیووت:

ـ ئەمجارەیان هەرە زەحمەت ترین جار ئەبێت. تۆ بەڕاستی کەوتویتەتە ناو تاقیکردنەوەکەوە. ئەمجارەش وەك جاری پێشوو دوو قامچی بەکاربهێنە، هەروەها شمشێرێکی دوو دەمیش، بەڵام پێویستە تۆ ئەمشەو سەری جادوبازەکە بپەڕێنیت! بەڵام ئەبێت زۆر وریابیت! ئاگاداربە نابێت بچووکترین بریسکەی تۆ چییە ببینێت کاتێك ئەچیتە ناو هۆڵە گەورەکەی شاخەکەوە، چونکە ئەمشەو هۆڵەکە وەکو ڕۆژی ڕووناك ڕۆشنە، بۆ تۆ زۆر زەحمەت ئەبێت جێیەك بدۆزیتەوە بۆ خۆشاردنەوە. بێ لەوەش

سۆزت ئەدەمی کە خۆشم لەگەڵت بێم
بێ ئەوەی ببینرێم، هەرچ کاتێکیش
دوچاری نارەحەتییەك بوویتەوە ئەوا
ئەوەی لەدەستم بێت بۆتی ئەکەم بۆ
ئەوەی ڕزگارت بکەم و لەوێ بتهێنمە
دەرەوە. بەڵام تەنها تۆ دانبەخۆتا
بگرە و ئازابە هەموو شتێك باش
ئەبێت. ئەمشەو جادوبازەکە تا دەرگای
دەرەوەی شاخەکە دیت بۆ ئەوەی
ماڵئاوایی لە شازادە بکات، لەوکاتەدا
کە ئەگەڕێتەوە ژوورەوە و پێش ئەوەی
شاخەکە بێتەوەیەك و دابخرێت ئەبێت
تۆ زوو بێیتە دەست و سەری بپەڕێنیت
و سەرەکەشی لەگەڵ خۆتدا بهێنیتە
درەوە.

هەموو شتەکان بەو چەشنەی
هاوڕێکەی بۆی باسکرد تێپەڕین. کاتێك
کاتژمێر بوو بە یانزەی تەواو پێتەر
جارێکی تریش دوای شازادە
کەوتەوە، بە درێژایی
ڕێگا زۆر بە خراپی کەوتە
قامچی کێشان بە
پشتی شازادەدا تا
گەیشتنە کێوەکە.



کاتێك چوونە ژوورەوە بۆ هۆڵە گەورەکە بینیان خۆر خۆی هاتووە
بۆ ئەوێ تا ناوجەرگەی شاخەکە ڕووناك بکاتەوە ـ ئەوێ وەك ڕۆژی
نیوەڕۆ ڕووناك بوو! لەسەر مێزەکە ماسیەکی درك درێژ دانرابوو
لەگەڵ چرایەکی ڕۆشنی عەرەبانەدا. بەڵام پشتی مێزەکە تاریك و
سێبەر بوو، بۆیە پێتەر لەویادا سەرلەنوێ خۆی شاردەوە.

شازادە بەپەلە چووە بەردەمی جادوبازە کێونشینەکە، خۆی
هەڵدایە باوەشی و خۆی بە ملیدا هەڵواسی و قیژاندی، بەدەنگێکی
نائومێدانەوە وتی:

ـ من خیانەتکارم! جارێکی کەش وەڵامەکەی ڕاست بوو! ئێستا
ئێمە چی بکەین؟

جادوبازەکە وتی:

ـ بەڕاستی ئەمە زۆر خراپە، ئەبێت ئێمە وەڵامێکی هێندە مەحاڵ
بۆ ئەو پرسیارەی تۆ بدۆزینەوە کە ئەو نەیزانێت. وەك سەری من!
ئەمە شتێکە تەنانەت مردووش بیری بۆی ناچێت، چونکە بێجگە لە
تۆ هیچ کەسی تر منی نەبینیوە!

شازادە وتی:

ـ ئەمەیان باشە. بەڵام بڕوانە، وای وت و دەستی کرد بە گلەیی
و گازندە، سەیرکە چۆن جەستەم لەم سەفەرە خەتەرناکەدا ونجڕ
ونجڕبووە. قۆڵ و قاچ و سەرم و هەموو پشتم لە خوێنا شەڵاڵبووە!

جادوبازەکە وتی:

ـ من خەم بۆ حاڵی تۆ ئەخۆم، ئەی خۆشەویسترین کەسی
من. بەڕاستی ئەمە تەواو ناخۆشبووە. بەڵام بەیانی ئەتوانی
هەموو جەستەت بخەیتە ناو خوێنی ئەم کەسە تازە هاتوەوە
و مەلەبکەیت تا هەموو برینەکانت خۆشببنەوە. بێجگە لەوەش





ئەوە بزانە لەبەرخاتری سەلامەتی تۆ من خۆم لەگەڵت ئەبم کاتێك ئەو بەیانی دێت بۆ لات، دیارە بەجۆرێك نەبینرێم. بڕوام پێبکە ئەمجارەیان لە هەڵهێنانی ئەو ڕازەی تۆدا سەرکەوتونابێت! بەوجۆرە جادوبازەکە شازادەی تا بەردەرگاکە بەڕێکرد، کە شازادە فڕی ئەو لە جێگای خۆیدا وەستا و تێڕوانی. کاتێك جادوبازەکە ویستی دیسانەوە بگەڕێتەوە بۆ ناو شاخەکە پێتەر لێی هاتەپێشەوە و بەیەك وەشاندنی شمشێرە دوو دەمیەکە سەری جادوزازەکە ناشیرینەکەی پەڕاند. دواتر سەرەکەی بە قژ هەڵگرت و بەخێرایی جارێکی تر بەبێ غافڵکردنی هیچ شتێك دوای شازادە کەوتەوە تا خۆی کردەوە بەناو پەنجەرەی ژوورەکەیدا. ئەوکات پێتەر فڕییەوە بۆ میوانخانەکە، باڵەکانی لە خۆی کردەوە و دڵخۆشبوو بەوەی بەو نزیکانە شازادە ئەبێت بە هی ئەو. دوای خەوێکی خۆشی شەوێ، بەیانی بەباشی خۆی ئامادەکرد بۆ چوون بۆ لای شازادە. لەگەڵ خۆیدا سەری جادوبازەکەی لە بوخچەیەکدا پێچایەوە و بردی. کاتێك ئەم جارەیان خۆی کرد بە ژووردا بۆ لای شازادە، بینی شازادە تەواو سیمای لە ترسا سپی بووە، بەجۆرێك کە بەزەحمەت ئەیتوانی پرسیارەکەی بکات. پێتەر پێش ئەوەی ئەو قسەبکات وتی:

ـ ئەی شازادەی بەشکۆ! ئەمڕۆ من هاتووم بۆ دواهەمین جار گوێم لە ڕازی سێهەمتان بێت. فەرموو ئێستا پرسیارەکەتان بکەن، بۆ ئەوەی بزانین ئەمجارەیان ئەم پرسیارە مایەی ژیان ئەبێت بۆ من یان مردن.

بەدەنگێکی لەرزۆکەوە، وەك ئەوەی ژیانی بەندبێت بە وەڵامەکەی ئەوەوە، شازادە پرسیاری کرد:

ـ ئەوەی من بیری لێ ئەکەمەوە چییە؟

پێتەر بێ ئەوەی وەڵام بداتەوە، گرێی بوخچەکەی کردەوە و سەری جادوزازەکەی خستە سەر مێزێکی ناو ژوورەکە.

شازادە کاتێك چاوی بەسەری بڕاوی جادوبازەکە کەوت چەند جارێك لەسەریەك وتی:

ـ کەوایە تۆ منت ڕزگارکرد! هێندەی نەبرد لەباوەشی پێتەردا بورایەوە. پێتەر بە وریاییەوە شازادەی خستە سەر قەنەفەیەك و

بانگی خزمەتکارەکانی کرد. هەر زوو هەندێك لە خزمەتکارەکان بەدەنگییەوە هاتن، پاشا و هەندێك لە دکتۆرەکانیش بانگکران. کاتێك شازادە هاتەوەسەرخۆی پاشا شازادەی بە پێتەر بەخشی تا بیکات بە هاوسەری خۆی، پێتەر سوپاسی پاشای کرد و وتی پێش هەرشت ئەبێت سەرێك لەو میوانخانەیە بداتەوە کە تیایدا بووە. عەرەبانەیەکی بەشکۆیان بە شەش ئەسپەوە بۆ هێنا، بەپەلە بەرەو شار ڕۆیشت و لەبەردەمی میوانخانەکەدا وەستا. هاوڕێکەی پێشوەخت لەبەردەمی دەرگاکەدا وەستابوو بۆ ئەوەی بەخێرهاتنەوەی بکات، بەحورمەتەوە یارمەتیدا تا لە عەرەبانەکە بێتە خوارەوە، دواتر هەردووکیان پێکەوە چوونە سەرەوە بۆ ژوورەکەی خۆیان.
لەویادا هاوسەفەرەکەی پێتەر بە پێتەری وت:
- کاتێك تۆ دوای ماوەیەکی کورتی تر لەگەڵ شازادەدا ئەچیتە جێگاوە، بێ ئەوەی شازادە پێ بزانێت لەگەنێکی گەورە پڕبکە لە ئاو و لەبەردەم تەختی خەوەکەتاندا دایبنێ. بۆ ئەوەی کاتێك شەو لە خەو بێدارئەبێتەوە و بەجێتئەهێڵێت هەمیشە سەرسمێك بدات و بکەوێتە ناو ئەو لەگەنە ئاوەوە. لەو کاتەدا کە



ئەکەوێتە ناو ئاوەکەوە تۆ تەواو جەستەی لە ئاوەکە هەڵکێشە. ئەوکات قەڵەڕەشکەیەك لەناویدا دێتەدەرەوە و ئەفرێت و لە پەنجەرەکەوە ئەچێتە دەرەوە. جارێکی تریش هەڵیکێشەوە ناو ئاوەکە، کۆترێك لەناویدا دێتەدەرەوە و لەسەر شانت ئەنیشێتەوە. کاتێك بۆ جاری سێهەم لە ئاوەکەت هەڵکێشا ئەوکات شازادا بەتەواوی لەدەست هەموو جادویەك ڕزگاری ئەبێت. لەوەبەدوا ئەو تۆی بەڕێزەوە وەك فریشتەیەکی ئاسمان خۆشئەوێت، ئەو کات لەبەرامبەرتا ئەبێت بە مەڕێك و بە درێژایی ڕۆژەکانی ژیانت ملکەچت ئەبێت. سێ جار ماچیبکە و دواتر بەئاسودەیی لەگەڵیدا بژی، چونکە تۆ ئەبیت بە پاشای ئەم مەملەکەتە دوای مردنی باوکی. ئێستا ئیتر هاوڕێم خۆش بژی، سوپاس بۆئەوەی لەگەڵ منت کرد! تۆ چیتر پێویستت بە من و بە یارمەتی من نەماوە، ئێستا من تۆ و ئەم دنیایە بۆ ئەبەد بەجێدێڵم. پێموایە ئێستا من قەرزی خۆم داوەتەوە بە تۆ.
لە چرکەساتی دوای ئەو قسانەدا هاوڕێکەی دیارنەما. پێتەر بەرێگای خۆیدا گەڕایەوە، دڵگرانبوو بەجیابوونەوەی هاوڕێکەی بەو دەمودەستە، هەروەها بەوەی فریا نەکەوت لەپای یارمەتیەکانیدا سوپاسێکی گەرمی بکات.
کاتێك پێتەر گەڕایەوە بۆ کۆشك هەموو شتێك پیشوەخت بۆ ئاهەنگەکەی لەگەڵ شازادەدا ئامادەکرابوو، لەشەوی ئاهەنگی زەماوەندەکەدا تەواو ئەو شتەی کرد کە هاوڕێکەی ئامۆژگاریکردبوو بیکات. کاتێك کچەکە

لەهەموو ئەو جادووانە ڕزگاری بوو ماوەیەك لەگەڵیدا بە ئاسودەی ژیا وەك ئەوەی پاشابێت. دوای ئەوەی بە ماوەیەکی کەم بەڕاستی بوو بە پاشا، تا ئەو ڕۆژەی لەژیانیدا مابوو لەسەر ئەم زەوییە، بەشێوەیەکی ئارام و باش فەرمانڕەوایی وڵاتەکەی کرد.

چیرۆکی ئەو کچە شازادەیەی کە جادوبازێکی کێونشین یاری بوو لەناو ئەو چیرۆکە لۆکاڵییە ئەڵمانیانەدا هەڵبژێراوە کە لە ١٨٠٠ کاندا کۆکراونەتەوە و چاپکراون. ئەو کەسەی لە پشتی ئەم کارەوە بووە کارڵ ئۆگەست ئیدوارد «١٨١٠ـ١٨٧٠» بووە. ئەم پیاوە مامۆستای دێ بووە لە زێلەرفێلد. سەرباری زەحمەتییەکی زۆری ئابوری لەو سەروەختەدا ئەم چیرۆکانەی چاپکردووە.



سەرچاوە:

Bra Böckers Folksago, del 1, 1987
Urval och översättning Jan – Öjvind Swahn







پاسەوانێک لە مەزرا، لە ساڵی ١٩٥١ـدا لەلایەن جەی. دی. سالنجەرەوە، وەک ڕەخنەیەک دژ بە کۆمەڵی مۆدێرن و بە تایبەت ئەمەریکا نووسراوە. ڕۆمانەکە بریتییە لە ژیانی سێ ڕۆژەی هۆڵدن کۆڵفیلڎ؛ لە قوتابخانە دەرکراوە و دەخوازێت بەرلەوەی نامەی دەرکردنەکەی بەماڵەوە بگات؛ بۆ خۆی لە شەقامەکانی نیو یۆرک دا پیاسە بکات و بسووڕێتەوە.

پاسەوانێک لە مەزرا، بەرلەوەی بە شێوەی کتێب بڵاو ببێتەوە، لە ساڵەکانی ١٩٤٥ و ١٩٤٦ـدا، بە بەش بەش لە ڕۆژنامەدا بڵاو بووەتەوە.

ئەم کتێبە لە هەندێک ناوچەی ئەمەریکادا، وەک کتێبێکی «نەشیاو» و «قەدەغە» لە قەڵەم دەدرێت و چووە لیستی کتێبە قەدەغەکانی دەیەی نەوەدەوە.

بە خوێندنەوەی ئەم ڕۆمانە، دەروازەیەکت بۆ دروست دەبێت، تا بە دوای کارەکانی دیکەی سالنجەردا بگەڕێیت، هەڵبەت دەبێت بزانیت، کە سالنجەر تەنیا ٤ کتێبی هەیە و ئەمە شاکار و تاقە ڕۆمانیەتی، کە هەرگیز نەیهێشت بە فیلم بکرێت.

ژوان جەلال، ئەم ڕۆمانەی لە زمانی یەکەمەوە کە ئینگلیزییە کردووە بە کوردی و لە ماوەی ڕابردوودا ناوەندی «غەزەلنووس» چاپ و بڵاوی کردووەتەوە.




**نووسینی: هاروکی موراکامی**
**خوێندنەوەی : خەزاڵ**

ئەم ڕۆمانە بە زمانی یابانی لە ۲۰۰۹ و ۲۰۱۰ دا بە سێ بەرگ بڵاوبوەتەوە و هەر لە مانگی یەکەمی بڵاوبوونەوەیدا ملیۆنێك دانەی لێ فرۆشراوە. چاپە ئینگلیزییەکەی بە قەبارەی ۹۲۵ لاپەڕە لە ئۆکتۆبەری ۲۰۱۱دا بڵاوبۆتەوە. گەر پڕفرۆشی ڕۆمانێك پێوەریش نەبێت بۆ خراپی و باشی ئاستە هونەریی و ئەدەبییەکەی بەڵام لە سەردەمی لەبیرچوونەوەی ئەدەبدا هەبوونی خوێنەر بۆ کتێبێك بەو قەبارەوە دڵخۆشکەرە.



ئاومامێ و تێنگۆ ناوی دوو کاراکتەری سەرەکی ئەم ڕۆمانەن، ماسامی ئاومامێ خانمێکی سی ساڵانە و ڕاهێنەری وەرزشییە لە یانەیەکی رەشاقەدا و لە هەمان کاتیشدا بکوژێکی پرۆفێشناڵە و لە ڕێگای چەقاندنی دەرزییەك لە بەشی دواوەی سەری قوربانییەکانی دەیانکوژێ، قوربانییەکانی ئاومامێ ئەو پیاوانەن توندوتیژی لەگەڵ ژنەکانیان بەکاردێنن، ئاومامێ بە درێژایی ڕۆمانەکە بە ناوی فامیلییەکەوە ناوی دێت.
تێنگۆ مامۆستای ماتماتیکە و خەریکی نووسینی ئەدەبییە بەڵام هیچی بڵاونەکردوەتەوە، ئەو لە ڕێگای سەرنووسەرێکی ئەدەبییەوە بەناوی کۆماتسۆ ناوی ئەو کەسانە جیا ئەکاتەوە کە بەشدارئەبن لە کێبرکێی خەڵاتی ئەدەبی گۆڤارەکە، لەکاتی جیاکردنەوەدا ڕێکەوتی ڕۆمانێکی کورت دەکا کە نووسەرەکەی کچێکی حەڤدە ساڵانە بە ناوی فوکا ئێری، هەرچەند ڕۆمانەکە شێوازی نووسین و ئاستی زمانەکەی خراپە بەڵام پلۆتەکەی و خەیاڵەکەی سەرنجی تێنگۆ و کۆماتسۆ ڕادەکێشن، کۆماتسۆ تێنگۆ ڕازیدەکا کە سەرلەنوێ ڕۆمانەکە بنووسێتەوە بۆ ئەوەی خەڵاتی نووسەری نوێ وەربگرێت و هەمی ببێتە پڕفرۆشترین کتێبیش، هەرچەند تێنگۆ ئەم کارەی بۆ قووت نادرێ و لە ئەنجامی ئاشکرابونەکەی دەترسێ بەڵام کۆماتسۆ ڕازیدەکات، لەزمانی کاراکتەری کۆماتسۆوە هۆکاری ئەو کارە تێئەگەین کە تۆڵەکردنەوەیەکە لە دونیای ئەدەبی، کۆماتسۆ لە لاپەڕە ٢٥ ی ڕۆمانەکەدا دەڵێت «من بۆ پارە ئەمە ناکەم، من بۆ ئەوە دەیکەم تا گاڵتە بە دونیای ئەدەبی بکەم»
لە پاڵ تێنگۆ و ئاومامێ کۆمەڵێك کاراکتەری گرنگی دیکە لەو ڕۆمانەدا هەن، فوکادا کە مامۆستای زانکۆیە و دوای شۆرشێکی قوتابیان کە لە ڕۆمانەکەدا باسدەکرێت زانکۆ جێدێڵێت و لەگەڵ کۆمەڵێك قوتابی و هاوڕێیدا کۆمەڵگەیەکی کشتوکاڵیی وەك کۆمۆنێك بە ناوی ساکیجاکی لە گوندێکی چیاییدا دروستدەکەن و بە کۆمەڵ دەژین. دواتر کۆمۆنەکە شێوەی ئاینێك وەردەگرێ و فوکادا دەبێتە سەرکردەیان و لەوەدوا لە ڕۆمانەکە بە سەرکردە ناوی دێت. ئێریکۆ فوکادا «فوکا ئێری» نووسەری ئەو ڕۆمانەیە کە تێنگۆ دووبارە دایدەڕێژێتەوە. کۆماتسۆ سەرنووسەری ئەدەبییە لە خانەیەکی بڵاوکردنەوە و هاوڕێی تێنگۆیە، شیزۆ



ئۆگاتا كە بێوەژنێكی دەوڵەمەندە و هاوڕێی ئاوامێیە و ئوشیكاوا پارێزەرێكە كە كار بۆ كۆمۆنەی ساكیجاكی دەكات.
ئەوەی هەردوو كارەكتەری تینگۆ و ئاوامێی پێكەوە دەبەستێتەوە ڕووداوێكی بچكۆلەیە: ڕۆژێك تەنها تێنگۆ و ئاوامێی لە پۆلێكدا دەبن و ئاوامێ توند دەستی تێنگۆ دەگوشێت و بێ ئەوەی هیچ بڵێت، نووسەر ئەمە دەكاتە بیانوویەك كە ئەم دوو كاراكتەرە دوای بیست ساڵ بە دوای یەكدا بگەڕێن، ئاوامێ هەستێكی لای تێنگۆ جێهێشتووە كە دوای ئەو هەموو ماوەیەش لەبیرینەكردووە.
لە پاییزی ساڵی ٢٠٠٦ ئەوكاتەی موراكامی لە هاوایی دەبێت تەنها دوو بیرۆكەی بۆ ڕۆمانەكەی هەبووە: كتێبەكە لەبارەی ژنێك و پیاوێك دەبێت كە بەدوای یەكدا دەگەڕێن و ئەویش هەوڵدەدات «ئەم چیرۆكە سادەیە تا ئەوڕادەیەی ڕێیتێدەچێ درێژ و ئاڵۆزبكات.»١» گەر ئەمە خەونی موراكامی بووبێت لە نوسینی ئەم ڕۆمانەدا ئەوا بەدڵنیاییەوە شكستی نەهێناوە.
ناونیشانی ڕۆمانەكە یاریكردنێكە لەنێوان حونجەكردنی ژمارە ٩ كە لەزمانی یابانیدا بە كیو دەخوێندرتەوە هاوكات كیو لە زمانی ئینگلیزیدا كورتكراوەی پرسیارە»٢»، موراكامی ڕۆمانی ١٩٨٤ی ئۆروێلی وەك یەكێك لە ئیلهامەكانی بۆ نووسینی ئەم ڕۆمانە وەسفكردووە ، لە چاوپێكەوتنێكیشیدا لەبارەی ئەو ڕۆمانەوە دەڵێت: دەمێك بوو دەمویست ڕۆمانێكی رابردووی نزیك هاوشێوەی ڕۆمانەكەی جۆرج ئۆروێل بنووسم»٥». سەرچاوەیەكی دیكەی ئیلهام بۆ موراكامی ئەو زنجیرە چاوپێكەوتنانەبووە كە لەگەڵ ڕزگاربووانی ئۆم»٣» سازیداوە دوای هێرشە گازییەكانی ١٩٩٥ و لەژێر ناوی **Underground** بڵاوكراوەتەوە.
ئەم ڕۆمانە بە خەیاڵێكی فراوان و چنینێكی زیرەكانە نووسراوە لە هەمان كاتیشدا پڕە لە وەسفی شتی سادە و ڕۆژانەیی، خاڵی بەهێز لە ناو ڕۆمانەكانی موراكامیدا ئەوەیە كە ئەو گێڕەرەوەیەكی زیرەك و بە سەلیقەیە و دەتوانێ یاری بە هێڵ و تێماكانی ناو ڕۆمانەكانی بكات، هەندێجار وەك ئەوەی كە ئەكرۆباتێكی لێزان بێت بەسەر پەتێكی باریكدا بڕوات و بازبدات ئاوا سەركێشانە گەمەی ڕۆماننوسین دەكات. بەڵام ئەوەی كە لەم كتێبەیدا كەمێك ماندووكەرە ئەوەیە بەشێكی ڕۆمانەكە بە باسی وردەكارییەكانی شێوازی جل وبەرگ و براندی فاشیۆن و خواردن دروستكردنی كاراكتەرەكانەوە دەبات كە هەندێجار خوێنەر وەڕس دەكات و هەمیشەش پەیوەندی بە بابەتی ڕۆمانەكەوە نییە. لە زۆر بەشی ڕۆمانەكەدا زۆر بە وردەكاریەوە باسی



ئامادەکردنی خواردنی ژەمەکان دەکا لە لایەن تێنگۆ و ئاومامێ وتەنانەت لەبەشەکانی دواییدا هەمان شت بۆ ئوشیکاوا دووبارە دەکاتەوە، دیارە نووسەر دەیەوێ لە ڕێگای پیشاندانی شتە بچووکەکانی ژیانیان دەیەوێت کەسایەتی کاراکتەرەکانیمان پێ بناسێنێت بەڵام هەمیشە هێڵێکی نەبینراو هەیە لەنێوانی ئەمە و کەوتنە ناو درێژدادڕییەك کە دواتر نووسەر نەتوانێت لێی بێتەدەرەوە. بۆ نمونە لە لاپەڕە ٧٣٨ باسی ئەوە دەکا لەو ئەپارتمانەی ئوشیکاوا تازە بە کرێ گرتوویەتی تا چاودێری تێنگۆی تیابکا، ئوشیکاوا بەلوعەی دەستشۆرییەکە دەکاتەوە و ئاو نایەت مانای ئەوەیە کە نوسینگەی خانووبەرەکە هێشتا ئاویان بەرنەداتەوە یانی ئوشیکا ناتوانێ توالێتەکە بەکاربێنێ؛ ئوشیکاوا لە سەتڵێك میز دەکا کە کۆمپانیای پاککردنەوەکە بەجێیان هێشتووە، لە لاپەڕە ٧٣٩ کە باسی هەمان ڕۆژ دەکا ئەمجارە بەلوعەکە دەکاتەوە و ئاو دێت؛ ئەمجۆرە باسکردنی وردەکاریی ناپێویست لە زۆر شوێنی ڕۆمانەکە دووبارە دەبێتەوە تا ئەوەی دەبێتە بەشێك لە ستایلی نوسینی موراکامی لەم ڕۆمانەیدا.





«قۆزاخەی هەوایی» ناوی ئەو کورتە ڕۆمانەیە کە کاراکتەری فوکا ئێری کە دیسلێکسیای هەیە نوسیویێتی و وەکو ڕاگر و سەنتەری ڕۆمانەکەی موراکامی وایە و گرێی ڕۆمانەکەی لەسەر ئەم کورتە ڕۆمانەی فوکا ئێری دروستکردووە، تا ئەو ڕادەیەی هەستدەکەیت کە موراکامی لە هەمان کاتدا دوو ڕۆمانی نوسیوە، قورسایی قۆزاخەی هەوایی تا ئەو ڕادەیەیە کە ئەگەر لە ڕۆمانەکەدا لایبەرین ئەوا هەموو پێکهاتەکانی ڕۆمانەکە دەڕمێت. لە دونیای ڕۆمانی قۆزاخەی هەوایی دوو مانگ لە ئاسماندا هەن، مانگێکی ئاسایی و مانگێکی نارێکی سەوزباویش کە شان بە شانی مانگەکەی دی لە ئاسماندایە، لەم دونیایەدا گروپێك هەن کە پێیان دەوترێ ئینسانی بچوك **The Little People** کە وەك هێزێکی بانسەر وەسفکراون کە توانای زانینی شتەکانیان هەیە و دەتوانن دەستبخەنە دیاردە سروشتییەکانەوە، لە چاوپێکەوتنێکدا موراکامی لەبارەیانەوە دەڵێت: «ئینسانە بچووکەکان لە پڕ هاتن. من نازانم ئەوان کێن. نازانم مانای چییە. من زیندانیی چیرۆکەکە بووم، من ئیختیارم نەبوو، ئەوان هاتن و من باسمکرد، ئەمە کاری منە.»٥» یەکەم دەرکەوتنی ئەوان لە قۆزاخەی هەوایی بەم شێوەیەیە: پاڵەوانی ڕۆمانەکە کە کچێکی دە ساڵانە و لە کێڵگەیەکدا لەگەڵ دایك و باوکیدا دەژیت، لەم کێڵگەیە کۆمەڵێك خەڵك ژیانێکی بە کۆمەڵ دەژین و خۆیان لە دونیای

دەرەوە دابڕیوە و لە ڕێگای کشتوکاڵکردنەوە
پێداویستی ژیانکردنیان دابیندەکەن. کچە دە
ساڵانەکە کاری ئاگاداربوونی مێگەلێك بزنی
پێدەسپێردرێ کە لەناویاندا بزنێکی پیری تێدایە
کە گرنگییەکی تایبەتی بۆ کۆمەڵگەکە هەیە،
ڕۆژێکیان لە بزنە پیرەکە بێئاگا دەبێت و بزنەکە
دەمرێت، لەلایەن کۆمەڵگاکەوە کچەکە وەك
سزا  بۆ ماوەی دە ڕۆژ لە ژورێکی تاریکدا  بەند
دەکرێت و لەو ماوەیەدا نابێ لەگەڵ کەسدا
قسە بکا، شەوێکیان شەش کەسی بچوك لە
ناو دەمی بزنەکە دێنە دەرەوە و لەگەڵ کچەکە
بە ڕاکێشانی پەتی سپی لە هەوا دەست بە
دروستکردنی قۆزاخەیەکی هەوایی دەکەن.
تێنگۆ و ئاومامێ ژیانیان دەکەوێتە ناو ئەو
دونیایەی کە لە ڕۆمانەکەی فوکا ئێری باسکراوە
و  ئەم دونیایە وەك پارالێلێکی دونیای ئاسایی
وایە، ئەوان ئیدی لە ژێر ئاسمانێکدان کە دوو
مانگی تێدایە. دوای ئەوەی یەکتر دەدۆزنەوە
هەوڵدەدەن لەو دونیایە رابکەن و بگەڕێنەوە
دونیای ئاسایی یان راستەقینە، لە کۆتایی
ڕۆمانەکەدا تێنگۆ و ئاومامێ پێکەوە
لە دونیای دوو مانگەکە دەچنە
دەرەوە، ئاومامێ سەیری
تابلۆیەکی ریکلامی بەنزین
دەکات کە پێش ئەوەی بکەوێتە ناو دونیا دوو مانگیەکە
لەهەمان شوێندا بینیوێتی و ئەوکات هەستدەکا تابلۆکە
پێچەوانەبوتەوە، لەوێدا ئێمە دڵنیانین داخوا ئەمە دونیای
ئاساییە یان وێنەی پێچەوانەبووەی ناو ئاوێنەیەکە.
ڕۆمانەکە لەوێدا تەوادەبێ کە تێنگۆ و ئاومامێ بەیەکەوە
لە قاتی حەڤدەهەمینی هۆتێلێکدا سەیری مانگ دەکەن تا
بزردەبێت و خۆر هەڵدێت.

پەراوێز:

١. ئەلیسۆن فلۆد، رۆژنامەی گاردیان،٢٦ ی حوزەیرانی **2009**

**2. Sam Anderson، «The Fierce Imagination of Haruki Murakami» The New York Times Maga- zine، October 21، 2011.**

٣. ئەلیسۆن فلۆد، رۆژنامەی گاردیان،٢٦ ی حوزەیرانی **2009**

٤.ئۆم تایفەیەکی یابانییە و لەلایەن چەندین وڵاتیشەوە وەك گروپێکی تیرۆریستی پۆلێنکراوە، ناوبانگیان دوای هێرشێکی گازیی بۆ سەر هێڵی مێترۆی یابان لە ٢٠ ی ئازاری **1995** بڵاوبوویەوە کە سیانزە کەسی تێدا کوژرا.

**5.Sam Anderson، «The Fierce Imagination of Haruki Murakami» The New York Times Maga- zine، October 21، 2011.**



**شوناس وئاڵۆزی**
**کایەی کتێب: کۆمەڵە وتار**
**ناوی نوسەر: مەریوان وریا قانیع**
**بڵاوکردنەوە: ناوەندی ڕۆشنبیری و هونەری ئەندێشە**

کتێبی شوناس و ئاڵۆزی کتێبی بەرگریکردنە لە ئاڵۆزیەکانی فیکر و لە ئاڵۆزیەکانی دوونیا، کتێبێکە دژ بەو خوێندنەوە تایبەتانەیە کە دیاردە ئاڵۆزەکانی دونیا بەشێوەیەکی ترسناک سادە دەکەنەوە، کە هەمیشە یەک مانا یەک وێنە و یەک ڕەهەندی دیاردەکان وەردەگرن و بەسەر هەموو دەرکەوت و وێنە و ماناکانی تردا دەیسەپێنن. ئەم سادەکارییە فرە ڕەنگە و هەرجارەو لەژێر ناوی بەرگریکردن لەدید و تێڕوانین و تیورەیەکی تایبەتدا دەردەکەوێت، ئاکاری هەرەسەرەکی ئەم جۆرە دەرکەوتنە گشتگیریە، گشتگیریەکی سادە و ڕەها کە جیاوازیەکان دەکوژێت و باز بەسەر ژینگە مرۆییەکاندا دەدات و ئەو خاڵەش ئینکار دەکات کە ئینسان بونەوەرێکی لێکدەرەوەیە، بونەوەرێکە تەفسیرخواز، کەسێکە مانا بەرەهەم دەهێنێت و ماناش بە شتەکانی دەورو بەری دەبەخشێت. گشتگیری نەخۆشیەکی فیکری و ڕۆشنبیریە و یەکێک لە هۆکارە هەرە سەرەکیەکانی بینینی ئینسان وەک بونەوەرێکی بێپرسیار.

دوژمنی سەرەکی ئەم کتێبە ئەو تەرزە فیکرەیە کە جگە لە ریتۆرێک، بەکوردییەکەی جگە لە قسەی زل و نەسەلمێنراو، جگە لە پێشداوەری قورس و نابەجێ و جگە لە حەز و ویستێکی گەورە بۆ موبالەغەکردن، هیچیتری نییە بەخوێنەری بدات و شتێکی ئەوتۆشی نییە لەسەر دونیا بیڵێت. بەمانایەکی دیکە ئەم کتێبە دوو دوژمنی سەرەکی هەیە، یەکەمیان ئەو فیکرەیە کەلەسەر گشتگیری دەژی و توانای قسەکردنی لەسەردیاردە و دەرکەوت و مانا کۆنکریتییەکان نییە، ئەویتریان ئەو فیکرەیەیە کە لەسەر داوەریکردن و نرخاندنێکی قورس و ڕەها و یەک ڕەهەندی دونیای دیاردەکان کار دەکات و ریتۆرێک ئاراستەی ئەکات و شتەکان بە لۆژیکی یان سپی یان ڕەش، یان باش یان خراپ و یان جوان یان ناشیرین ئەبینێت.

